# سیاسەت و حکوومەت لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا

نووسینی: دکتۆر بێهزاد شاهەندە

وەرگێڕ: مێهدی مێهرپەروەر

هەولێر - ٢٠٠٨

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **سیاسەت و حکوومەت لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا**
- نووسینی: دکتۆر بێهزاد شاهەندە
- وەرگێڕانی: مێهدی مێهرپەروەر
- نەخشەسازی ناوەوە: طــه حسین
- پیتچنین: کاوە حسین
- بەرگ: هۆگر صدیق
- ژمارەی سپاردن: (١٦٣٢)
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣١١)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا بەدرێژایی دووسەد ساڵی رابردوو بەهۆی شۆڕشە زانستی، پیشەسازی و نەتەوەییەکان، گۆڕانکارییەکی قووڵ و هەمەلایەنەی بەسەردا هاتووە. لە دە وڵاتی ناوچەکە (بێرمە، تایلەند، ڤێتنام، لاوس، کامبۆدیا، مالیزیا، سەنگاپوور، ئەندونیزیا، برۆنی و فیلیپین). وڵاتی سەنگاپوور ئێستا بە داهاتی سەرانەی دە هەزار دۆلاری خۆی چووەتە ریزی وڵاتانی پەرئەستین و بە زوویی مالیزیا، تایلەند و ئەندونیزیاش وەك سەنگاپوور رێگای سەرکەوتن دەپێون و دەچنە ریزی وڵاتانی پیشەسازیی جیهانەوە. سەرەتای گۆڕانکاریی ئەم ناوچەیە بۆ ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم دەگەڕێتەوە. لە ڕوانگەی لێکۆڵەرانەوە، مەسەلەی گرینگی ئەم ناوچەیە لە دوو سەد ساڵی رابردوودا مۆدێرنیزەبوون و بە ڕۆژئاواییبوون نییە، بەڵکو مەسەلەی بنەڕەتی خۆ رێکخستنی ناوچە لەگەڵ گۆڕانکارییە نوێیەکان و لەهەمان کاتدا پاراستنی بایەخە لەمێژینەکانە.

لەم کتێبەدا هەوڵمانداوە بۆ خوێندکارانی بەشە زانستی سیاسی، ئابووی و کۆمەڵایەتییەکان تابلۆیەك لەم ناوچە نەناسراوە بدەین بە دەستەوە. بەو هیوایە ئەم بەرهەمە بتوانێ رێنوێنێك بێ بۆ لێکۆڵینەوەی کامڵتر. ئێمە لەسەر ئەو بڕوایەین بە ناسینێکی گشتی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، دەتوانین رێرەوی لێکۆڵینەوەکانی دوایی رۆشن بکەین یان لانی کەم بەهاندانی کەسانی دیکە رێگا بۆ لێکۆڵینەوەکانی دوایی خۆشبکات. ئەم کتێبە کە لەبەردەستان دایە بەرهەمی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی مەیدانی چەندین ساڵەی نووسەرە ،کە لە دە فەسڵی جیاوازدا و بە کردەوە بەدوای یەکدا داڕێژراوە.

فەسڵی یەکەم تایبەتە بە ناوچەناسی و نیشاندانی بارودۆخی جوگرافیایی، ئابووری، سیاسی، ئەتنیکی و فەرهەنگی ناوچەکە. لە فەسڵی دووەمدا ئێمە پێمان لەسەر ئەم خاڵە داگرتووە کە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا تابلۆیەکی سپی نەبووە، کە ئەوروپاییەکان



وێنەکانی خۆیانیان لەسەر رەسم کردبێ. لەم فەسڵەدا بە تێروتەسەلی ئاماژە بە ئیمپڕاتۆرییەکان و شارستانییەتە گەورەکانی ناوچە وەك ئانگوز، پاگان، شری و جایا و گەورەیی و شکۆی لەمێژینەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا کراوە. لە فەسڵی سێهەمدا تایبەت بە لێکۆڵینەوەیەکی شیکارانەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا پێش لە هێرشی بەربڵاوی ئەوروپاییەکانە، کە ئەمە خۆی دەروازەیەکە بۆ باسەکانی تری ئەم کتێبە.

بابەتێکی دیکە لێکۆڵینەوەی بارودۆخی کەمایەتییەکان و بێگانەکانە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (پێش لە هێرشی بەربڵاوی ڕۆژئاوا بۆ ناوچەکە). ئامانج لە پێشکەشکردنی ئەم باسە، ناسینی وردی کێشە ئەتنیکی، فەرهەنگی و مەزهەبییەکانە لە ئاستی ناوچەکەدا، کە بە تەواوی لەسەر کاروباری کۆمەڵگا کاریگەریی هەبووە و هەیەتی. فەسڵی پێنجەم و شەشەم تایبەتە بە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ لە هێرشی ڕۆژاوا بۆ ناوچە و ئاسەوارە باش و خراپەکانی ئەو هێرشە بەتایبەت کاریگەریی ڕۆژئاوا لەسەر ئابووری و ژیان و گوزەرانی خەڵکی ناوچەکە.

باسی دوایی هەوڵێکە بۆ ناساندنی کۆچەرە ئاسیاییەکانی ئەم ناوچەیە، چوونکە سەرەتا چینییەکان و پاشان هیندییەکان کاریگەرییەکی زۆریان لەو ناوچەدا هەبووە و هەیە. لەبەر ئەوە بەبێ ئەوە کە لە چۆنیەتی هاتن و دەور و کاریگەرییان بکۆڵینەوە، دەکرێ بڵێین ناتوانین بە تەواوی لە کێشەکانی ئەم ناوچەیە تێبگەین. باسەکان زیاتر پەیوەندیان بە کۆمەڵناسی سیاسییەوە هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە بیروڕامان وایە، کە کۆمەڵگا و سیاسەت دوو دیاردەن کە بە تەواوی پەیوەندییان پێکەوە هەیە و ناسینی هۆکارە کاریگەرەکان لە سیاسەتدا خستنەڕووی وێنەیەکی دروستی ناوچەکە بە پێویست دەزانرێ.

پاش باسە سەرەکییەکان ئاماژەمان بە گۆڕانکارییەکان و خەباتە سیاسییەکان کردووە. فەسڵی نۆیەم تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی گۆڕانکارییەکانی ئەم ناوچەیە لە دوو دەیەی (بیست) و (سی)ی سەدەی بیستەم و لەوەدا ئاماژە بە بزووتنەوە نەتەوەییەکان، پێکهاتنی حزبەکان، گۆڕانی شێوازی خەبات لە فۆرمی نەریتییەوە بۆ فۆرمی نوێ و هتد... کراوە، وشەی گومان لەبەرئەوەی کەڵکی لێ وەرگیراوە، کە هیوای زاڵبوونی بەسەر کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاوا زۆرکەم بوو و وەك دەڵێن چێو لە تاریکی کوتان بوو. هیچ کەس لە نوخبە سیاسییەکان هیوایەکی ئەوتۆیان نەمابوو، کە بتوانن لە ماوەیەکی کورتدا بەسەر داگیرکەراندا سەرکەون. پەلاماری

چارەنووسسازی ژاپۆن بۆ ناوچەکە بابەتێکی دیکەیە کە خاڵێکی وەرچەرخانە لە مێژووی ئەم ناوچەیەدا. ژاپۆن لە ماوەی دەسەڵاتی داگیرکەرانی سێ ساڵەی خۆیدا گۆڕانکاری لە ناوچەکەدا پێکهێنا و ناڕاستەوخۆ خەڵکی بۆ سەرکەوتن بەسەر کولونیالیزمی ڕۆژئاوادا ئامادەکرد. گەلاڵەی ئاسیا بۆ ئاسیاییەکان و هەوڵی بێ ئاکامی ژاپۆن بۆ پێکهێنانی ناوچەیەکی گەشەکردووی هاوکاریی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وێنەیەکی دیکەی کردەوەکانیەتی.

لە فەسڵی کۆتایی کتێبەکەدا بارودۆخ و هەلومەرجی سیاسی پاش سەقامگیری حکوومەتە سەربەخۆکان لە هەشت سەردێڕی سەربەخۆدا هاتووە. لە باسەکانی ئەم فەسڵەدا ئاماژەکراوە بە خەباتەکان، سەرکەوتنەکان، ڕێکخستنە سیاسی و حزبییەکان وەك ((ئاشی ئان)) و ڕێکخراوە ناوچەییەکانی دیکە، هەروەها مەسەلە جۆراوجۆرەکانی وەك شارنشینی، کۆچ، دەسەڵاتخوازی، پەرەسەندنی سیاسی و ئابووری و پێکهاتە حکوومەتییەکان.

هیوادارین کە ئەم کتێبە لە ناسینی باشترین ناوچەکەدا کاریگەربێ و مۆدێلە سەرکەوتووە ئابووریی، سیاسی و فەرهەنگییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای ناساندبێ.

# فەسڵی یەکەم

## ناوچەناسی

بەکوێ دەڵێن باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا؟

سەرەتا پێویستە ئاماژە بە گرینگی ناوچەیەك بكەین كە پێی دەگوترێ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ناوچەیەك كە هەم لەڕووی پانتایی و هەم لەڕووی حەشیمەتەوە جێگای سەرنجە. حەشیمەتی وڵاتی ئەندونیزیا نزیكەی ١٨٠ ملیۆن كەسە[1]. كەمتر بایەخ بەم مەسەلەیە دراوە، كە ئەم وڵاتە دوورگەییە لەڕووی حەشیمەتەوە پلەی پێنجەمی هەیە لە جیهاندا و پاش چین، هندستان، ڕوسیاو ئەمەریكا لە پلەی دوایی دایە. كۆماری سۆسیالیستی ((ڤیتنام))یش بە حەشیمەتێك نزیك بە ٧٠ ملیۆن كەس سەر بە وڵاتانی پڕ حەشیمەتی جیهانە و یەكێكە لە چوار وڵاتی ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا كە زیاتر لە ٤٠ ملیۆن كەس حەشیمەتی هەیە. ئەو ژمارانەی باسكران هەرچەند ورد و دەقیق نین، بەڵام گرینگی ناوچەیەك نیشاندەدا كە زیاتر لە یەك لەسەر هەشتی حەشیمەتی جیهانی لەخۆیدا جێكردووەتەوە. گرینگی ئەم ژمارەیە كاتێك دەردەكەوێ كە لەگەڵ حەشیمەتی چین كە لە نێوان ٢٠ هەتا ٢٥ لە سەدی حەشیمەتی جیهان پێكدێنێ، بەراورد بكرێ.

پانتایی جوگرافیایی و ڕێژەی حەشیمەت لەخۆیدا بە مانای دەسەڵاتی زیاتر نییە و ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەم ناوچەیەش ڕاستە. تا ئێستا هیچ كام لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نەیانتوانیوە بن بە دەسەڵاتێكی جیهانی وەك ئەوەی، كە هەندێك لە وڵاتانی ئەورووپای

(١) دانیشتوانی ئەندۆنیزیا گەلێ لەو ژمارە زیاترە. وەرگێڕی كوردی



پێش جەنگی دووەمی جیهانی بوون. ڕەنگە ئەم گومانە بێتە پێشێ كە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە سەدەكانی ڕابردووشدا ڕۆڵی سەرەكییان لە پەیوەندیی نیونەتەوەییدا نەگێڕابێ. بۆ ڕەوینەوەی ئەم گومانە دەبێ لێكۆڵینەوەیەك لەسەر مێژووی پڕ شكۆی ئەم ناوچەیە بكرێ. ئاكامی ئەم لێكۆڵینەوانە نیشانیدەدات، كە تێگەیشتنێكی لەو چەشنە بە هیچ شێوە دروست نییە. چونكە سەرەڕای خوێندنەوەی شارستانییە نەناسراوەكانی ئەم ناوچەیە و بەراوردی ئەوانە لەگەڵ شارستانیەتەكانی ئەمڕۆدا، لاوازی ئەم شارستانیەتە دەردەكەوێ. دیارە دەبێ وەبیربێنینەوە، كە لێكۆڵینەوەی ئێستا لە شارستانیەتەكانی پێشووی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵات لەگەڵ ئەو لێكۆڵینەوانەی كە سەد ساڵ لەمەوپێش لەسەر ئەو ناچەیە كراوە، بەتەواوی جیاوازن، سەد ساڵ پێش كە دۆزەرەوەكان، لێكۆڵەران و بەرپرسانی لەشكری و حكوومەتی ڕۆژئاوا پێیان نایە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، هیچ گومانێكیان لە زاڵبوونی خۆیان بەرامبەر بە خەڵك و شارستانیەتی ئەو ناوچەیە نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ كە لاوازی شارستانیەتی ڕۆژئاوا ڕۆژ بە دوای ڕۆژ ڕوونتر دەبێتەوە، جۆری ڕوانین بەرامبەر بەم ناچەیە و گەورەییەكەشی گۆڕانی بەسەرداهاتووە.

لەندەن لە قۆناغی ئیمپراتۆری ڕۆمدا پێیان دەگوت لوندینیوم[1] و شارێكی زۆر بچووك، پیس و بێ بایەخ بوو. ئەم شارە لە ١٠٦٦ی زایینیدا بەهۆی تاج لەسەرنانی ویلیام نورماندی[2] بە حەشیمەتێكی نزیك بە سی و پێنج هەزار كەس بووە بە شارێكی پاشایەتی. ئەمڕۆ لە زەینی ئێمەدا لەندەن دیمەنێكی دزێوی نییە و پێمان وایە كە هەموو كاتێك ئەم گەورەیی و شكۆیە ڕواڵەتییەی هەبووە. بەڵام پێش لەمە، ئەو كاتە كە ناوەندی لەندەن لە ئارادانەبوو، كامبودیا بە حەشیمەتێكی نزیك بە یەك ملیۆن كەس، لەسەرووی تەواو شارەكانی ئەو كاتەی ئەورووپاوە بوو. دەتوانین ئەم پێشكەوتنە لە بیناسازی، سیستەمی ئاودێری و توانای سێ جار بەرهەمهێنانی برنج لە ساڵدا، ببینین. ئاوی ئەم شارە لە ڕابردوودا ئانگور بووە و لە ڕووی تەكنیكی و پیشەییەوە پێشكەوتوویی خۆی لەو سەردەمەدا سەلماندووە[3]. گەورەیی ئەم

(1) Londinium.
(2) William of Normandy.
(3) Tarling; N; A Concise History of Southeast Asia; New York, 1966.

شارستانیەتە کە زیاتر لە شەش سەدە درێژەی کێشا لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە چەندین کتێب و بابەت سەبارەت بە گەورەیی لەندەن و پاریس نووسرابوون، روون بووەوە. یەکەم کەسایەتی رۆژئاوایی کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆدەهەمدا پێی نایە ئانگور، بانگەشەکەرێکی مەزهەبی فەرەنسی بوو بەناوی بوایڤۆ[1] کە لە سەفەرنامەی خۆیدا سەرەڕای گێڕانەوەی سەفەرەکەی، تەنیا ئاماژەیەکی کورتی بەم شارستانییەتە گەورەیە کردووە و بایەخەکانی لەبەرچاو نەگرتووە.

زۆرجار لەمەڕ شارستانییەتەکانی دیکەش دۆخی وا بەرچاو کەوتووە. شارستانییەتەکانی ئەثینا، ئیسپارت و هتد... بەهۆی ئەو هەموو کتێبانەی کە سەبارەت بەوان نووسراون، هەموو کاتێك لە زەینی ئێمەدا زیندوون و مێژووی رۆژئاوا رێزیان لێدەگرێ، بەڵام لە تەنیشت ئەم پێداهەڵگوتنانە، باسی ئیمپڕاتۆرییەکی گەورە بێنم کە بۆ ماوەی سێ سەدە (یازدەهەم تا سێزدەهەم) حکوومەتی دەکرد و سەرچاوەی خزمەتگوزاری و نوێبوونەوەی زۆر بوو نەکراوە. ئیمپراتۆری بەشکۆی ((پاگان))یش بە دڵنیاییەوە هاوشانی ئیمپڕاتۆری ئانگور بووە، هەرچەند زانیارییەکی زۆر لەو بارەیەوە لەبەردەستدا نییە[2].

کەواتە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا خاوەنی شارستانییەتی گەورەبووە و زانیاری کەمی ئێمە لەو پەیوەندییەدا بۆ کەمتەرخەمی خۆمان دەگەڕێتەوە، نەك نەبوونی شارستانییەتێك لەو ناوچەیەدا. لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەستی ئێمە لێکدانەوەی بەربڵاوی مێژوو و شارستانییەتی ئەم ناوچەیە نییە، چونکە کارێکی زۆر تاقەت پروکێنە و بەکردەوە بەدەرە لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەڵام بەهۆی ئەم نەناسراوییە، بابەتێکی باشە بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆرتر.

لێرەدا باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا مانای گشتی هەیە. پەنجا ساڵ لەمەوپێش بەکارهێنانی ئەم ناوە دەبووە مایەی سەرسامیی لێکۆلەران. ئەو کات، ناوچەیەك کە ئێستا پێی دەگوترێ، باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وەك ناوچەکانی سەرووی هیندستان دەناسران و ناوچەکانی سەرووی کەنداوی ((بەنگال))یان تەنیا تایبەت بە کۆمەڵەی بچووکی هیند دەزانی. ئەم جۆرە ناولێنانانە

---

(1) Father Bouillevau.
(2) Wolters, O. W.; History, Culture and Religion in southeast Perspectives; Singapore, 1982, pp.90-95.



زیاتر لایەنی سیاسی پێوە دیاربوو، بۆ نموونە ناوی ناوچەکانی سەرووی هیندستان بەهۆی نفووزی سیاسی-فەرهەنگی چین لە ڤییتنام و ئیسپانیا لە فلیپین بەم ناوچەیە درابوو. باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاش هەتا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی ئاسیای ((مۆنسۆن))[1] یان پێدەگوت. ئەم ناوە لەبەر ئاووهەوای گشتی ناوچە هاتووە کە چەند مانگێکی ساڵ (سپتامبر هەتا فوریە) بەردەوام بارانی زۆری لێ دەبارێ، بەڵام ئەم ئاووهەوایە تەنیا تایبەت بەم ناوچەیە نییە و لە وڵاتانی سەریلانکا و بەشکانی باشووری ((چین))یش هەیە، هەربۆیە دەتوانن بەشێك لە مونسون پێکبێنن.

پێش جەنگی دووەمی جیهانی، ناوچەیەك بەناوی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لەلایەن بیانییەکانی نیشتەجێی ناوچە، لێکۆڵەران و تەنانەت خودی ناوچە قبووڵ نەدەکرا. پاش شەڕو پێکدادانەکانی ناوچە، لەم شەڕانەدا چەمکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا سەری هەڵداو لەڕووی سەربازی و ستراتیژییەوە، ناوچەیەك دیاریکرا کە نە هیندستان بوو نە چین و نە بەشێك لە زەریای ئارام. ئەم ناوچە نوێیە کۆمەڵێك وڵاتی وەك بێرمە، تایلەند، ڤییتنام، لاوس، کامبۆدیا، مالیزیا، سەنگاپوور، ئەندونزیا و برۆنی لەخۆ دەگرت[2]. نەهێنانی ناوی فلیپین بە ئەنقەست نەبوو، چونکە لەکاتی پێکهاتنی ئەم کۆمەڵەیە (١٩٤٠) سەبارەت بە بەئەندامبوونی ئەم وڵاتە شك و گومان هەبوو. ئەم گومانە هەتا کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ کە فلیپین چووە ریزی نۆ ئەندامەکەی دیکەی ناوچەکە، درێژەی کێشا.

ناکرێ باشووری رۆهەڵاتی ئاسیا تەنیا لە بواری ستراتیژی و سەربازییەوە بە ناوچەیەکی جیاواز لە ناوچەکانی دیکەی جیهان دابنێین، چونکە جیاکردنەوەی ناوچەیەك لە ناوچەکانی دیکە و قبووڵکردنی سەربەخۆیی جوگرافیایی و فەرهەنگی ئەم جگە لە مەسەلە ستراتیژییەکان خاڵی هاوبەشی دیکەش دەخوازێ. لە دەیەی ١٩٢٠ مێژوونووسان و ئەنترۆپۆلۆژیستەکان خەریکی دەستنیشانکردنی ئەو خاڵە هاوبەشانەن، کە لە وڵاتانی ئەم ناوچەدا هەن. بۆ نموونە رێوڕەسمە فەرمی و دەریایە تا رادەیەك وێکچووەکان لە ئاستی ناوچەدا دەتوانرێ وەك نەریتی هاوبەش سەیر بکرێ و هاوبەشییەکی زۆر لە پێکهاتەی بنەما و دامەزراوەکانی دیکەدا هەیە.

---

(1) Asia of Morsoons.
(2) Hall, D. G. E. Intro.; Atlas of Southeast Asia; London, 1964.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی مێژوونووسان و لێکۆڵەرانی زانستی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاورێکی زۆرتریان لەسەر لێکدانەوەی مەسەلەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وەك ناوچەیەکی جیاواز، داوەتەوە. ئێستا کەمتر کەسێك هەیە، کە ئەم ناوچە وەك هیندستانی بچووك یان چین ناوببا و تاڕادەیەك هەموو لایەك پێیان لەسەر ئەم راستییە داگرتووە کە ناوچەیەکی تایبەت، بە فەرهەنگێکی سەربەخۆ و جیاواز لە رۆژهەڵاتی هیندستان و باشووری چین بوونی هەیە. لێکۆڵەران دەستیان داوەتە خوێندنەوەی کاریگەریی فەرهەنگی هیندستان و چین لە فەرهەنگی بێرمە و تایلەند و لە هەوڵی ئەوەدان هەتا فەرهەنگی خۆجێی ئەم ناوچەیە و رێژەی کاریگەریی و کارتێکردنی ئەو لەگەڵ فەرهەنگەکانی بێگانە تاوتوێ بکەن. بایەخی کاریگەری مەزهەبی هیند لەسەر ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا نکۆڵی لێ ناکرێ. هەروەها چەمکە هونەرییەکان و شێوازی بیناسازیی هیندستان لەگەشە و گۆڕانکاری هونەری باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا رۆڵێکی گرینگی هەبووە سەرەڕای ئەمانە، گەورەیی و تایبەتمەندییەکانی پاگان، ئانگور، پەرستگەکانی جاوە[1] بە تەواوی جیاوازن. پەیکەرە گەورەکانی بوودا لە تایلەند کە -ژمارەیان یەکجار زۆرە- لەگەڵ پەیکەرەکانی بوودا لە هیندستاندا جیاوازی بەرچاویان هەیە. تەنانەت لە ڤییتنام کە بەرامبەر بە وڵاتانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا کاریگەریی زۆرتری وەرگرتووە و هەزار ساڵ لەژێر رکێفی فەرهەنگی کۆنفۆسیۆشی چیندا بووە، رەسەنایەتی فەرهەنگی غەیرە چینی لە دەرەوەی کۆشکی پاشایەتی و لەنێو خەڵکدا بە تەواوی دیار و بەرچاوە و دەریدەخا، کە ئەم وڵاتە وەرگری فەرهەنگی چینی نەبووە، بەڵکو رەسەنایەتییەکی کۆنی هەبووە[2].

لێکۆڵەران بەم ئاکامە گەیشتوون کە بایەخێکی لەرادەبەدەر بە کاریگەریی فەرهەنگی هیندستان و چین دراوە و ئەو خاڵە هاوبەشانە کە لە ناوچەدا بوون لەبەرچاو نەگیراون. بۆ نموونە، چەمکی بنەماڵە لەم ناوچەیەدا وەك بڕیارێکی سەرەکی لە ئارادایە، نەوەك بنەماڵەیەکی گەورە (کاست)، وەکو ئەو شتەی کە لە فەرهەنگی هیندا هەیە یان پێگەی ژنان لە فەرهەنگی

(1) Java.
(2) Lebar, F., G. Hickey and J. Musgrave; Ethnic Groups of Mainland Southeast Asia; New Haven, coon. 1967. pp. 45-46.



نەریتی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بەشێوەیەکە کە لە کۆمەڵگاکانی چینی و هیندی کە ئازادیی ژنان لەواندا یەکجار بەرتەسك کراوەتەوە، بە تەواوی جیاوازە.

مەسەلەیەکی دیکە لەو ناوچەدا زمانی هاوبەشە کە ئەگەر سەرنجێك لە زمانی خەڵکی ناوچەکە بدرێ بۆمان دەردەکەوێ. بۆ نموونە لە ناوچەیەکی بەربڵاو لە بێرمە، باشووری چین، لاوس و تایلەند دا خەڵك بە زمانی تایی[1] قسە دەکەن، ئەم مەسەلەیە، واتە بەربڵاوی خەڵکی تایی، زمان دیاردەی یەکیەتی ئەتنیکی ئەم ناوچەیەمان پێ نیشاندەدا. ئەوەی راستی بێ سنوورە دەستکردەکان یەکیەتی خەڵکی ناوچەی لەنێوبردووە. لە باسەکانی دیکەدا زیاتر دەچینە سەر باسی سنوورەکانی ئەم ناوچەیە، کە بێجگە لە ڤییتنام هەموو دەستکردی کولونیالیزمی رۆژئاوایە. یەکێکی دیکە لە خاڵە هاوبەشەکانی زمان کە زۆر گرینگە، بەربڵاوی زمانی مالایدا[2]، ئەم زمانە بە زاراوەگەلی جۆراوجۆر لە وڵاتانی مالیزیا، برۆنی، ئەندونزیا، و باشووری فیلیپین باوە و لە چەند ناوچەیەك لە باشووری تایلەند، کامبۆدیا و ڤییتنامیشدا دەبینرێ. لەبەر ئەوەی ژمارەیەك لە خەڵکی مالایی لە کۆنەوە لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون. بەشێوەی گشتی دەتوانین بڵێین کە ئەگەر کەسێك زمانی (مالایی) بزانێ، لە هیچ یەك لە وڵاتانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیادا گیروگرفتی بۆ نایەتە پێش[3]. ئەم زمانە ئەوەندە پەرەی ئەستاندووە کە تەنانەت غەیرە مالایەکان، واتە چینییەکان و هیندییەکانیش فێری بوون و لە ژیانی رۆژانەیاندا وەك پێویستییەك بەکاری دێنن.

هەندێك جار خاڵە جیاوازییەکان لە ناوچەدا ئەوەندە جیددی نین، کە ئەمە رەنگە ئەو کەسانە تووشی سەرلێشێواوی بکا کە شارەزای ناوچە نەبن. هەربۆیە ((یەکیەتی لە جۆراوجۆریدا))[4] بووەتە دروشمی خەڵکی ئەندۆنزیا کە ماناکەی کۆکردنەوەی خەڵکی ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵاتە لەژێر ئالایەك و پێداگرییە لەسەر هاوبەشی مەزهەبیی و زمانی بۆ پێکهێنانی یەکیەتی.

ئەو پانتاییەی کە بە ٣٥ پلەی پانی و نزیکەی ٥٠ پلەی درێژییە و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای لەخۆگرتووە گەلێك جیاوازی جوگرافیاییمان نیشاندەدا. بەشێوەی گشتی چڕبوونی

(1) Tai.
(2) Malay.
(3) Andaya, B. W. and L. Y.; A History of Malaysia, London, 1982, P.71.
(4) Unity in diversity.

حەشیمەت لە ناوچە نزمەکانی کەناری دەریا، چۆم و گۆلەکاندا زۆرترە و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاش لەم چوارچێوە گشتییە بەدەر نییە. لەم رووەوە چڕبوونی حەشیمەت لە باکووری ڤییتنامدا بووەتە هۆی جیاوازی سیستەمی وەرزێری و کارکردن لە دەوروبەری چۆمی سوور[1] و دەوروبەری دلتای چۆمی مکونگ[2] و دوو جۆر ژیانی جیاوازی پێکهێناوە. مەسەلەیەکی جێگای سەرنج ئەوەیە، کە لە سنوورەکانی چۆمی ((مکونگ))یش بەهۆی روانینە جیاوازەکانی دوو وڵاتی ڤییتنام و کامبۆدیا بۆ مەسەلەکانی ژیان، شێوەی ژیانی خەڵکی ئەم ناوچانە لەگەڵ یەکتر جیاوازە.

دەکرێ بڵێین تەواوی بەشەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لە ناوچەی گەرمدا هەڵکەوتووە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە ژیان و گوزەرانی خەڵك وەك یەکە. بۆ نموونە ژیان و کێشەکانی ئەو خەڵکەی کە لە ناوچە بەرزەکانی تایلەند، بیرمە و لاوسدا دەژین، جیاوازە لەگەڵ بارودۆخ و کێشەکانی ئەو خەڵکانەی کە لە ناوچەکانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دەژین[3]. پانتایی جوگرافیایی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بە جۆرێکە کە لەلایەك، ناوچە وشکارۆکانی بیرمە دەگاتە کێوە بە بەفر داپۆشراوەکانی ئیریان جایا[4] (گینیای نوێی رۆژئاوا)[5] لە کۆتاییەکانی کۆمەڵە دەرگەکانی ئەندونزیا و لەلایەکی دیکە لەورگە سەرسەوزەکانی باکووری رۆژئاوای ڤییتنام هەتا کێڵگەکانی برنجی دوورگەکانی فیلیپین درێژەی هەیە. ئەم ناوچە بەرینە، سەر زەوینی جیاوازییەکان و جۆراوجۆرییەکانە کە گرینگترینیان جاوازی نێوان شارو گوندەکانە. گەشەی شارەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا یەکێك لە سەرەکیترین گۆڕانکارییەکانی سەدەی بیستەمە، بەتایبەت پاش جەنگی دووەمی جیهانی. بە هێنانەدی چەند نموونەیەك دەتوانین لە قووڵایی ئەم گۆڕانکارییانە ئاگاداربین. ئاپۆڕەی بانگوك[6] (پایتەختی تایلەند) لەسەرەتای دەیەی ٩٠دا نزیکەی ٧ ملیۆن کەس بووە، لە حاڵێکدا تەواوی ئاپۆڕە ئەم وڵاتە لە سەد ساڵ

(1) Red river.
(2) Mekong River delta.
(3) Bastin, J. and H. J. Benda; A History of Modern southeast Asia, Englewood Cliffs, N. J., 1967, PP. 109-110.
(4) Irian Jaya.
(5) West New Guinea.
(6) Bangkok.



لەمەوپێش تەنیا شەش ملیۆن کەس بووە. دەکرێ بانکۆك لەڕووی گەشیکردنەوە لەگەڵ شارەکانی دیکەدا بەراوەرد بکرێ، شارەکانی وەك سەنگاپوور (پایتەختی سەنگاپوور)[1] بە ئاپۆڕەیەکی نزیك بە دوو ملیۆن و پێنج سەد هەزار کەس، جاکارتا[2] هەشت ملیۆن کەس، پێنیوم پێن[3] (لە کامبۆدیا) یەك ملیۆن کەس و هوشی مین[4] چوار ملیۆن کەس. ئەم شارانە لەبەر ئاپۆڕەی روو لە گەشەیان، بوونەتە هۆی راکێشانی گوندنشینەکانیان.

تایبەتمەندی دیکەی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا ئەوەیە، کە ئەم ناوچەیە بەردەوام تووشی ناسەقامگیری سیاسی بووە و هەیە. ئەم ناسەقامگیرییە بەهۆی بارودۆخی کۆلۆنیالیزم و مێژووی دوورودرێژی کۆلۆنیالیزم لەم ناوچەیە و ئاسەوارەکانیەتی. تەنیا وڵاتێك کە لە نێو دە وڵاتی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا هیچ کات داگیرکراو نەبووە، تایلەند بووە. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەم وڵاتەش تووشی چەندین مەسەلە و کێشەی ناوچەیی و نا سەقامگیری سیاسی بووە. بێجگە لە تایلەند هەموو وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لەژێر کۆنترۆڵی کۆلۆنیالیزمی رۆژئاوادا و لە جەنگی دووەمی جیهانیی ، لەلایەن ژاپۆنەوە داگیرکراوە. چ وێکچوون و جیاوازییەك لە ئەزموونە هاوبەشەکانی ئەم وڵاتانەدا دەبینرێ؟ ئایا لەڕاستیدا هیچ جیاوازییەك لەوەدا هەیە، کە بەریتانیا ئەم وڵاتانەی داگیرکردبێ یان فەڕەنسا یان هۆڵەندا یان ئەمەریکا؟ بۆچی هەندێك لەم داگیرکەرانە ناوچەکەیان بە ئاشتی و رێککەوتن چۆڵکرد، وەکو بەریتانیا و ئەمەریکا و هەندێکیان وەك هۆڵەندا و فەڕەنسا بەشەڕ وەدەرنران؟.

بۆ لێکۆڵینەوەکردن لەسەر کاریگەری رژێمە کلۆنیالیزمییەکان لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا، سەرەتا دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە، کە خودی کۆلۆنیالیزم لە مێژووی ئەم ناوچەیە چەندە گرینگ و بایەخدارە؟ ئەو وەڵامانەی دراونەتەوە بە سەرنجدان بە بوارە جۆراوجۆرەکان و ئەزموونە لێکنەچووەکان جیاوازن. لەم کتێبەدا هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە هەلومەرجی ناوچە بەو شێوەیە کە بووە و هەیە نیشانی بدەین. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ ئەو هۆکارانەی کە بوونەتە هۆی پێکهاتنی ئاڵوگۆڕی جۆراوجۆری سیاسی، ئابووری و

(1) The City stat of Singapore.
(2) Jakarta.
(3) Phnon penh.
(4) Ho Chi Minh.

کۆمەلایەتی (هەندێك جاریش بەتەواوی پێچەوانە) دەستنیشان بکەین، هەتا بگەینە ئەو ئەنجامەی کە بۆچی ئەو گۆڕانکارییانە لەو وڵاتانەی کە شارستانیەت و مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە، کاریگەریی جیاوازی هەیە. لەو ناوچەیەی کە جێگای سەرنجی ئێمەیە جیاوازییەکان سەرسووڕهێنەرن، بۆ نموونە؛ زۆربوونی ژمارە و جۆراوجۆری مەزهەبەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا بەشێوەیەکە کە وێنەی لە هیچ ناوچەیەك لە جیهاندا نابینرێ. لە ناوچەکانی وەك مالیزیا، بڕۆنی و ئەندونزیا ئایینی زۆربەی خەڵك ئیسلامە. بوودیز تراوادا[١] مەزهەبی نەتەوەیی تایلەندە و لە کامبۆدیا لایەنگری زۆری هەیە[٢] (بە سەرنجدان بە گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییانەی کامبۆدیا، دوورنییە، کە ئەم مەزهەبە جارێکی دیکە پەرە بگرێ). هەندێك لە ناوچەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا وەك فلیپین، بەتووندی کەوتۆتە ژێر کاریگەری مەسیحییەکەوەو لە هەندێك شوێنی دیکە هێشتا حەیوانپەرەستی دیاردەیەکی باوە. لایەنگرانی مەزهەبی هیندو کە تایبەتمەندی خۆیان هەیە لە دوورگەی بالی[٣] و لومبوك[٤] لە وڵاتی ئەندونیزیا دەژین. هەرچەندە کۆمونیزم لە کۆماری سۆسیالیستی ڤییتنامدا رەسمییەتی هەیە، ئایینی کونفوسیوس هەروا لە دڵی خەڵکدا زیندووە. دیارە پاش گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییانە و سیاسەتی دەوڵەتی هانووی، کەمتر پێ لەسەر کۆمونیزم وەك ئامانجێکی سیاسی بیروباوەڕی دادەگیرێ و شتێکی چاوەڕوان نەکراو نییە، کە بەزوویی شاهیدی بووژاندنەوەی مەزهەب و ئایینەکانی پێشوو لە ڤییتنام دابین.

دوای ئەو روونکردنەوانە و ئاشنایەتی لەگەڵ ناوچەکەدا ئاماژە بە هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دەکەین. دە وڵات لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا هەن کە ئاپۆڕەکەیان نزیك بە ٤٣١ ملیۆن و ٤٥ هەزار کەسە. لەم ژمارەیەدا ٢٥٠ هەزار کەس لە بڕۆنی، ٤٠ ملیۆن لە بێرمە (میانمار)، ١٨٠ ملیۆن لە ئەندونزیا، ٧,٧ ملیۆن لە کامبۆدیا، ٤ ملیۆن لەلاوس، ٢,٥ ملیۆن لە سەنگاپوور، ١٧ ملیۆن لە مالیزیا، ٥٩ ملیۆن لە فیلیپین، ٥٦ ملیۆن لە تایلەند ٦٥ ملیۆن لە ڤییتنام (ڤییتنامی یەکگرتوو-کۆماری

(1) Thera Vada Buddhism.
(2) History, Culture and Religion in Southeast Asian Perpective, p.97.
(3) Bali.
(4) Lombok.



سوسالیستی ڤییتنام)دا دەژین. پێکهاتەی ئەتنیکی ئەم ئاپۆڕانە تێکەڵاوە و لەمەر یەك لە وڵاتانی ناوبراودا چەندین نەژادی جۆراوجۆر هەیە. نەژادی مالایو- پولنزی[١] کە زیاتر لەنیوەی دانیشتووانی ناوچەیەك دێنن، زیاتر لە وڵاتانی ئەندونزیا، فیلیپین، مالیزیا، سەنگاپوور و بڕۆنی بڵاوبوونەتەوە. دووەمین نەژاد و چسنی تبتی[٢]یە کە لە بێرمە، تایلەند، ڤییتنام و لاوس دا دەبینرێن. نەژادی مون-خمێر[٣] لە نیمچە دوورگەی هیند و چین نیشتەجێن و رێژەی خمێرەکان لەنێو ئەواندا زۆرترە، بەجۆرێك کە زۆربەی دانیشتووانی وڵاتی کامبۆدیا پێکدێنن. لە تەواوی وڵاتانی ناوچە کەسانی غەیرە خۆجێی کە زۆربەیان چینی و هیندین دەبینرێن (لە خەسڵەتانی دواییدا سەبارەت بە رۆڵی ئەم گرووپە غەیرە خۆجێییانە بە تیرۆتەسەلی دەدوێن).

لەگەڵ ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا ئاپۆڕەی شارەکان یان بەشێوەیەکی گشتی شارنشینی پەرەسەندنێکی بێ وێنەی بەخۆوە بینیوە، هێشتا زۆربەی خەڵکی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا لە گوندەکاندا دەژین. بۆ نموونە لانیکەم ٦٠ لە سەدی خەڵکی مالیزیا لە گوندەکاندا دەژین. هەروەها مەزهەبە جیاجیاکانی ناوچە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو هەرێمەدا رۆڵی کاریگەری گێڕاوە. زۆربەی دانیشتووانی ئەندونیزیا، مالیزیا، برۆنی و بەشەکانی باشووری وڵاتی فیلیپین لاینگری ئایینی ئیسلامن. بەڵام زۆربەی خەڵکی سەنگاپوور، بێرمە، تایلەند، لاوس، کامبۆدیا و ڤییتنام مەزهەبەکەیان بوودییە.

لایەنگرانی ئایینی هیندوش لانیکەم. ١٠ لە سەدی دانیشتووانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا پێکدێنن. دوای ئەوەی کە داگیرکەرانی ئەوروپایی بەتایبەت ئیسپانیاییەکان، مەسیحییەتیان هێنایە ناوچە، زۆربەی دانیشتووانی وڵاتی فیلیپین بوونە لایەنگری مەزهەبی کاتولیك هەر لەبەر ئەمەیە، کە ئەم وڵاتە تا کۆتایی دەیەی شەست بەشێك لە وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا پێك نەدەهێنا.

خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا مێژوویەکی دوورودرێژ و پڕ کارەساتیان تێپەڕکردووە و خاوەنی چەندین شارستانییەتی وەك ئانگور، پاگان و شری و جایا بوون کە هەر یەکەیان لەکاتی خۆیدا بەرامبەر بە شارستانییەتەکانی دیکە لە سەرووتربوون. نەتەوە جۆراوجۆرەکانی

(1) Malayo – Polynesian.
(2) Sino – Tibetan.
(3) Mon – Khmer.

ناوچەکە بیرەوەری تاڵی کولونیالیزمیان هەروا لەبیرە، چونکە هەموو وڵاتانی ناوچە، بێجگە لە تایلەند، ماوەیەکی دوور و درێژ لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانی رۆژئاوایی و ژاپۆنییەکاندا بوون. داگیرکەرانی رۆژئاوایی کە لەژێر سێبەری شمشێر و خوێن رشتندا بەسەر خەڵکی ناوچەدا حوکمیان دەکرد نزیکەی چوار سەدە ئەوانیان دەچەوساندەوە و ئەو سەر زەوییەیان بە تاڵان دەبرد.

یەکەمین داگیرکەر کە پێی نایە ئەم ناوچەیە پورتوگالییەکان بوون کە لە ساڵی ١٥١١ی زاینی دەستیان بەسەر بەندەری گەورەی مالاکا[1]- لە گەرووی ستراتیژیکی مالاکا-دا گرت و ئەو شانشینەیان کە یەکێك لە گەورەترین حکومەتەکانی ئەوکات بوو، رووخاند. پاشان بۆ بەدەستهێنانی بەهارات کە لەو ساڵانەدا یەکێك لە گرینگترین داواکارییەکانی ئەوروپاییەکان بوو، گەیشتنە مولوکاس[2].

ئیسپانیا لە دەیەی شەشەم و حەوتەمی سەدەی شانزدەهەمدا فیلیپینی داگیرکرد. داگیرکەرانی هۆڵەندی و بەریتانیاش لە سەدەی حەڤدەهەمدا هاتوونەتە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. هۆلەندییەکان دوو سەدە لە نیمچە کیشوەری مالایا[3] شەڕیان کرد، هەتا سەرئەنجام ئیمپراتۆریی کۆلۆنیالی خۆیان، بە ناوی ((کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی هۆڵەندا))[4] لە ئەندونزیادا سەقامگیرکرد.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا بەریتانیا دەسەڵاتی خۆی بەسەر مالایادا قایم کرد و لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا سەرتاسەری نیمچە دوورگەی مالایا، باکووری کالی مانتان (برنئوی پێشوو)[5]، کە پێکهاتووە لە برۆنی، ساراواك[6] و سەبا[7] داگیرکرت و لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا پاش سێ شەڕی داگیرکەرانە، بێرمەی خستە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی. فەرەنساش چووە پاڵ داگیرکەران و لە ساڵەکانی ١٨٦٠-١٨٩٠ دەستی بەسەر ڤیەتنام، لاوس

(1) Malaka.
(2) Malluccas.
(3) Malaya Archipelago.
(4) Dutch East – Indies Company.
(5) Kalimantan (Borneo).
(6) Sarawak.
(7) Sabah.



و کامبۆدیادا گرت و کولونیالی هیند و چینی فەرەنسای دامەزراند. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ئاکامی شەرەکانی ساڵی ١٩٨٩ لەگەڵ ئیسپانیا و سەرکەوتنی بەسەر ئەو وڵاتەدا، بە دانی ٢٥ ملیۆن دۆلار فیلیپینی لە ئیسپانیا ئەستاند و خاکەکەی داگیرکرد. بەم شێوەیە، فیلیپین کە زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ لە مێژووی خۆی لە پرسنگەکانی ئسپانیادا تێپەڕ کردبوو و کلێسای ئیسپانیا کۆنترۆڵی ئەو شوێنەی لە ئەستۆدا بوو، ٤٦ ساڵی دیکەی لە مێژووی خۆی لەژێر سێبەری مۆدێلەکانی هالیوودا تێپەڕاند و دوای ساڵەهای ساڵ، سەرئەنجام بە سەربەخۆیی ڕواڵەتی خۆی گەیشت.

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرد، تایلەند تاقە وڵاتی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بوو کە سەربەخۆ مابووەوە. سەربەخۆیی ئەم وڵاتە دوو هۆی سەرەکی هەبووە: یەکەمیان تێگەیشتوویی سیاسی رێبەرانی وڵات و ئەوی دیکەیان هەڵکەوتوویی جوگرافیایی تایلەندە. ئەم وڵاتە لە نێوان ناوچە داگیرکراوەکانی بەریتانیا و فەرەنسادا هەڵکوتبوو و داگیرکەران وەك ناوچەیەکی لەمپەر دانیان پێدا نابوو. تایلەند سەرەڕای سەربەخۆیی ڕواڵەتی بەهۆی کێبەرکێکانی بەریتانیا و فەرەنسا بە شێوەی نیو داگیرکراو بەرێوەدەچوو و دەسەڵاتە کۆلۆنیالییەکان چەندین رێککەوتننامەی شوومیان بەسەر ئەم وڵاتەدا سەپاند و سەربەخۆییەکەیان کردە ئەفسانەیەك.

قۆناغی کۆلۆنیالی ناوچەی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا فەسڵێکی زۆر گرینگ لە مێژووی ئەم ئاو و خاکە پێکدێنێ کە بە کردەوە رێگای گەشەکردنی ئەو ناوچەیەی گرتبوو. داگیرکەرانی رۆژئاوایی ئەوان ئەو ناوچەیەیان کردە ناوەندی بەرهەمهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و هەڵێنجانی ماددە خاو و کانزاییەکانو کردیانە گرینگترین ناوچە بۆ وەگەرخستنی سەرمایەی دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان. سەرئەنجام خەڵکی ئەو ناوچەیە لەژێر زوڵم و زۆری لەڕادەبەدەردا راپەڕین. دەکرێ بزووتنەوەی گشتی خەڵکی جاوە لەدژی هۆڵەندییەکان بە یەکەمین شۆڕشی خەڵکی ناوچە لە سەدەی حەڤدە و هەژدەدا ناو ببەین. ئەم بزووتنەوەیە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەرفراوان و گرتووتر بوو و کۆڵەکەکانی حکومەتی کولونیالیزمی هۆڵەندی لەرزۆك کرد.

وەرزێرانی جاوە بە رێبەرایەتی دیپگورو[1] ماوەی ٥ ساڵ (١٨٢٥-١٨٣٠) لە دژی هۆڵەندا شەڕیان کرد و بناغەی حکومەتەکەیان خستە مەترسییەوە. چەندین بزووتنەوە و شەڕی دیکە لە

(1) Diponegoro.

سوماترا روواندا، کە بەناوبانگترینیان شەڕی پادری[١] و ئاچە[٢] بوو. سەرەڕای شکستی روالـەتی ئەم بزووتنەوانە لە بەرامبەر هۆڵەندا ئەوان وەك ژیلەمۆ مانەوە و پاشـان کلّپـەیان سـەند و بوونـە سەمبولّی خەباتی خەڵکی ئەندونزیا.

عەدالەتخوازی تەنانەت تایبەت بە ئەنـدونزیا نـەبوو، بـەڵکو وڵاتـانی دیکـەی ناوچـەش خوازیاری ئەوە بوون. لە دەیەی حەوتەم و نۆهەمی سەدەی نۆزدەهەم لە مالایا دوو شۆڕشـی گەورە دژی داگیرکەرانی بەریتانیا روویدا. خەڵکی ڤییتنام و کامبۆدیا لە دەیەی هەشـتەم و نۆهەمی ئەم سەدەیە، دژی فەڕەنـسییەکان روویـان کـردە زنجـیرە شـەڕێکی پـارتیزانی. لـە بێرمەش شەڕی جەماوەری کە لە ساڵی ١٨٥٠ دەستی پێکردبوو، بووە شۆڕشـێکی گـەورەی نەتەوەیی و بەریتانیا بۆ سەرکوتکردنی دە ساڵ هەوڵیدا[٣].

خەڵکی فیلیپین لە لاوازی حکوومـەتی کولونیـالی ئیـسپانیا کـە لـە ئەمـەریکای ناوەندیـدا خەریکی شەڕ بوو کەڵکی وەرگرت و یەکەمین شۆڕشی ئازادیخوازی نەتەوەیی باشووری رۆژهـەڵاتی ئاسیا- ١٨٩٦ تا ١٨٩٨- شکلی گرت و یەکەمین کۆماری دامەزراند، بەڵام بە رێککەوتنێك کە لە پاریس لە نێوان ئەمـەریکا و ئیـسپانیای شکـست خـواردوودا، بەسـترا، ئەمـەریکا جێگـای کولونیـالیزمی ئیـسپانیای لـە فیلیپینـی گرتـەوە و بەتـەواوی هێـزەوە چـووە شـەڕی کۆمـاری تازەپێگرتووی فیلیپین و لە ساڵی ١٩٠٢ کۆنترۆڵی ئەم وڵاتەی گرتە دەست و زیاتر لـە چـل سـاڵ لەو وڵاتەدا حکوومی کرد.

سەرەڕای هەموو شکستەکان، خەباتی خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسـیا بـەردەوام بـوو و رۆژ بەرۆژ پەرەی ئەستاند. شکستی ئیمپراتۆری بەڕواڵەت زلهێزی رووسـیای تێـزاری بەدەسـتی وڵاتێکی بچووکی ئاسیایی؛ واتە ژاپۆن لە ساڵی ١٩٠٤-١٩٠٥ کۆتایی بە ئەفسانەی لە شکان نەهاتووی دەسەڵاتە ئەوروپاییەکان هێناو بووە هۆی چوونە سـەری ورەی بەشـی زۆری خـەڵکی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئاسـیا. رەنگدانـەوەی شۆڕشـی یەکـەمی رووسـیا (١٩٠٥-١٩٠٧) و سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧) لە ناوچـەدا زۆر بـوو و بـووە هـۆی پەرەئەسـتاندنی شۆڕشەکان و بزووتنەوەکانی خەڵکی ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا[٤].

(1) Padri.
(2) Ache.
(3) Hall, D. G. E.; A History of South-East Asia London, 1982, pp.75-79.
(4) Coedes G.; The Making of Southeast Asia; Berkeley, Cal., 1986, P.61.



بە چوونە سەری ئاستی تێگەیـشتنی زۆرتـری خـەڵکی ناوچـە لـە زوڵـم و چەوسـاندنەوەی داگیرکـەران، ئـەوان روویـان کـردە پێکهێنـانی حـزب و خـەباتی خۆیـان رێکخـست. حزبـە سیاسیەکانی ئەندونزیا لە ساڵی ١٩٢٠، حزبەکانی هیند و چین، مالایا و فیلیـپین لـە ١٩٣٠، حزبی بێرمە لە ١٩٣٩ و حزبی تایلەنـد لـە ١٩٤٠ دامـەزران و بەرنامـەی دیاریکراویـان بـۆ بەردەوام بوونی خەبات گەڵاڵە کـرد. بزووتنـەوە ئازادیخوازانـەکان لـە ئەنـدونزیا (بزووتنـەوەی نەتەوەیی ئەندونزیا لـە سـاڵەکانی ١٩٢٦-١٩٢٧)، بزووتنـەوە وەرزیرییـەکان لـە ڤیـەتنام و فیلیپین و شۆڕشی بورژوازی ساڵی ١٩٣٢ لە تایلەند- کە کۆتـایی بـە حکوومـەتی سـەرەڕۆی پاشایەتی هێنا- وەك چالاکیی سیاسی خەڵکی ناوچە دێتە ئەژمار.

دوای داگیرکردنی وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لەلایەن ژاپۆنەوە، بزووتنەوە و شۆڕشی سەربەخۆییخوازانە رووی لە زیادبوون کرد. (دیـارە تایلەنـد بـەهۆی رازی بـوون بـە تێپـەڕینی ژاپۆنییەکان لەو وڵاتەو هەندێك رێککەوتنی دیکە لە دەستدرێژی ژاپۆن پارێزران).

بەڕواڵەت مەبەستی ژاپۆن لە داگیرکردنی ئـەم وڵاتانـە لـە قۆنـاغی یەکەمـدا نەهێـشتنی تەواوی ئاسەواری کولونیالیزمی رۆژئاوا و پێشگیری لە گەڕانەوەی رۆژئاواییەکان بـۆ باشـووری رۆژهەلاتی ئاسیا و لە قۆنـاغی دووەمـدا پێکهێنـانی ناوچـەی هاوکارییـە گەشـەکردووەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیا بوو[١]. ژاپۆنییەکان بە دروشمی ((ئاسیا بۆ ئاسیاییەکان)) وایان دەنوانـد، کـە دەیانهەوێ وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسـیا لـەژێر کۆلۆنیـالیزمی رۆژئـاوا رزگاربکـەن لـە حالێکدا ئەم دروشمە تەنیا بۆ هەڵخەڵەتاندن بوو، ژاپۆنییەکان بەتەمابوون بەسەر ئەم ناوچـەیەدا حکوومەت بکەن. سەرەڕای ئەمە ناکرێ حاشـا لـەوە بکـەین، کـە ژاپۆنییـەکان نەخوازراوانـە خزمـەتیان بـەم ناچـانە دەکـرد، چـونکە بەدرێـژایی مانـەوەی ژاپـۆن لـەم وڵاتانـەدا، هێـزە سەربەخۆییخوازەکان گیانێکی نوێیان هاتەوە بەر و بەشێوەیەکی رێکوپێك خۆیان رێکخـستەوە و هیوایەکی زۆرتریان بۆ بەردەوام بوونی بزووتنەوەکانیان لادروست بـوو. هێـزە رۆژئاواییـەکان بەبێ شەڕو خوێن رشـتن ناوچـەیان بەجێهێـشتبوو و تەسـلیمی ژاپۆنیـان کـرد. ژاپـۆن کـە لـە ناوچەیەکی بەربلاّودا سەرگەرمی شەڕ بوو بە کردەوە، نەیدەتوانی بەسەر یەك یەکی وڵاتەکانـدا چاوەدێری بکا، هەربۆیە کاروباری ئەوانی لەژێر چاوەدێری خۆیدا تەسلیمی هێزە نەتەوەییـەکان

(1) Greater East-Asia Co- Prosperity Sphere.

کرد. ڕێبەرانی باشووری ڕۆهەڵاتی ئاسیاش لەم هەلە زێڕینە بەباشی کەڵکیان وەرگرت. پاش شکستی ژاپۆن لە جەنگی زەریای ئارام هەندێك لەم وڵاتانە بەبێ شەڕ و پێکدادان لەگەڵ داگیرکەرانی پێشوو (بەریتانیا و ئەمەریکا) و هەندێکیان بەشەڕ و پێکدادانی دووبارە لەگەڵ ئەوان (فەڕانسە و هۆڵەندا) سەربەخۆیی خۆیان بەدەست هێنا. دەتوانین بڵێین کە ژاپۆن بەشێوەیەکی نەخوازراو ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕا، لە سەربەخۆبوونی ئەم وڵاتانەدا.

لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا بەرەی یەکگرتووی نەتەوەیی ڤییتنام (ڤیت-مین)[1] سوپای گەلی فیلیپین، سوپای دژی ژاپۆنی گەلی مالایا، بزووتنەوەی ئازادی تایلەند، کۆمەڵەی دژی فاشیستیی بێمە، سوپای بچووکی ئەندونزیا (پێتا)[2] و... پێکهاتن و لەگەڵ پاشماوەکانی ڕژێمە کولونیالیستەکان و نەزمی نوێی[3] ژاپۆن خەباتیان کرد. سەرئەنجام خەباتی بەربڵاوی خەڵکی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا بووە هۆی دەرچوونی ژاپۆن لە ناوچە و سەربەخۆیی ئەم وڵاتانە. بوونی ڕێبەرانی نیشتمانپەروەری وەك ئەحمەد سۆکارنۆ[4]، محەمەد هاتا[5]، هوشی مین[6]، تنگو عەبدولرەحمان[7]، لی کوان یو[8] و ئانگ سان[9] لە هۆکارە گرینگەکانی ئەم سەرکەوتنەیە. شۆڕشی ئووتی ١٩٤٥ی ڤییتنام بووە هۆی پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کۆماری دیموکراتی لەو وڵاتەدا. لە ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٨٤٥ ئەندونزیا بە ڕێبەرایەتی ئەحمەد سۆکارنۆ سەربەخۆیی ڕاگەیاند و شۆڕشگێڕانی ئەندونزیا کۆتاییان بە تەمەنی ٣٥٠ ساڵەی کۆلونیالیزم لەم سەر زەوییەدا هێنا. بێرمەش لە ژانویەی ١٩٤٨ پاش خەباتێکی توندوتیژ، بە پشتیوانی خەڵکی ئەم وڵاتە سەربەخۆیی بەدەستهێنا. لە ژوئیەی ١٩٤٦، هاوکات لەگەڵ ساڵڕۆژی سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، فیلیپین وەك وڵاتێکی بەڕواڵەت سەربەخۆ مەوجوودییەتی ڕاگەیاند.

(1) Viet-Minh.
(2) Peta.
(3) New Order.
(4) Ahmand Soekarno.
(5) Mohammad Hatta.
(6) Hochi Minh.
(7) Tungku Abdul Rahman.
(8) Lee Kuon Yew.
(9) Aung Sann.



هاتنە ئارای دەوڵەتی خەڵکییەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و پەرەگرتنی بزووتنەوە ئازادیخوازە نەتەوەییەکان بووە هۆی ترس و نیگەرانی ئیمپڕیالیستەکان و ئەوان کەوتنەخۆ بۆ رووخانی دەوڵەتە تازە دامەزراوەکان.

داگیرکەرانی هۆڵەندی کە توندترین ڕژێمی کولونیالیان لە ئەندونزیا دامەزراند بوو، بە پشتیوانی ئەمەریکا و بەریتانیا (١٩٤٦-١٩٤٩) کەوتە شەڕ و بەربەرەکانێ لەگەڵ کۆمارە تازە سەربەخۆبووەکانی ئەندونزیا (هۆڵەندییەکان بەڕادەیەك ڕەگەزپەرست بوون، کە ڕەگەزپەرستەکانی دیکە لە چاو ئەواندا جوامێر بوون). خەڵکی ئەندونزیاش پێداگرانە لە بەرامبەر ئەواندا ڕاوەستان و لە ساڵی ١٩٤٩ هۆڵەندایان وا لێکرد، دان بە کۆماری ئەندونزیادا بنێ و ئەوانیان لە وڵاتی خۆیان دەرکرد. لە ساڵی ١٩٥٦ بەرپرسانی ئەندونزیا بە هەڵوەشانەوەی تەواوی ڕێککەوتننامە و پەیماننامە زۆرە مڵییەکانی هۆڵەندا کوتاییان بە تەمەنی ئەم ڕژێمە داگیرکەرە هێنا.

هەوڵ و کۆششی ئیمپڕالیستەکان بۆ بەدەستەوەگرتنی کۆنترۆڵی دووبارەی وڵاتانی نیمچە دوورگەی هیند و چین شکستی هێنا. دەستێوەردانی فەڕەنسا لە کۆماری دیموکراتی ڤییتنام بووە هۆی زنجیرەیەك شەڕی پارتیزانی کە لانیکەم ٩ ساڵ درێژەی کێشا. سەرئەنجام لە شەڕی مێژوویی دین بین فو[1] (مارسی ١٩٥٤) لە ناوچەیەك لە باکووری هانۆیدا، فەڕەنسا کە لە دووبەرەدا دژی نیشتمانپەروەرانی ڤییتنامی و لاوس شەڕی دەکرد، شکستی خوارد و ناچار بوو مل بۆ ڕێگا چارەی ئاشتییانە ڕاکێشێ. لە ئاوریلی ١٩٥٤ کونفراسی ژنێڤ[2] پێکهات کە لەودا وەزیرەکانی کاروباری دەرەوەی پێنج دەسەڵاتی گەورەی جیهان (بەریتانیا، چین، سۆڤییەت، ئەمەریکا، فەڕەنسا) و کۆماری دیموکراتی ڤییتنام، لاوس، کامبۆدیا، نوێنەرانی حکوومەتی دەستکردی باشووری ڤییتنام واتە سایگون (هوشی مینی ئێستا) بەشداربوون. لەم کۆنفرانسەدا کۆتایی شەڕی هیند و چین ڕاگەیەندرا و دان بە سەربەخۆیی ڤییتنام، لاوس و کامبودیا نرا[3]. بەڵام ئەمەریکا کە پاش جەنگی دووەمی جیهانی وەك هێزێکی

(1) Dien Bienphu.
(2) Geneva Conference on Ind-China (1954).
(3) McAlister, J. T; Vietnam: The Origins of Revolution, New York, 1968, pp. 27-28.

سەرکەوتوو ناسرابوو لە دەیەی ١٩٥٠ و **١٩٦٠** سەربەخۆیی وڵاتانی هیند و چینی سەرکوت کردو ڕێککەوتننامەی ژنێڤ کە بۆ خۆی یەکێك لـە دامەزرێنـەرانی بـوو خـستە ژێـر پـێ. ئەمەریکا هەروەها ڕێککەوتننامەی کۆتایی کۆنفراسی ژنێڤی ئیمزا نەکرد، لەبەرئەوەی بـەو پێیە بڕیار بوو لە **١٩٥٦** هەڵبژاردنی ئازاد لە سەرتاسەری ڤێتنام بەڕێوەبچێ و ئەمەریکا لە ترسی سەرکەوتنی شیوعییەکانی ڤێتنام لەم هەڵبژاردنەدا لـە قبـووڵکردنی ڕێککەوتتنامـە خۆی بوارد و بەردەوام بوو لە پشتیوانی کردنی حکوومەتی دەستکردی ڤییتنامی باشوور[(١)].

بەم شێوەیە، شەڕ لە هینـد و چـین دوو دەیـەی دیکـە بـەردەوام بـوو، هـەتا سـەرئەنجام ئەمەریکا لە ساڵی **١٩٧٣** ڕێککەوتننامەی پاریسی ئیمزاکرد و خۆی لـە گێـژاوی ڤییتنـام ڕزگارکرد. حکوومەتە دەستکردەکانی ئەمەریکا لە ڤییتنامی باشوور پاش ئەوە نـەیانتوانی لە بەرامبەر سەربەخۆیخوازانی ڤییتنامی ڕاوەستن، لە ساڵی **١٩٧٥** دوای پەلامارێکی بەربڵاو ناچاربوون تەسلیم بن. لە ساڵی **١٩٧٦** سەرتاسەری ڤییتنـام لـەژێر نـاوی ڕژێمـی کۆمـاری سۆسیالیستی ڤییتنام[(٢)]دا بووە و وڵاتێکی یەکگرتوو.

لە ساڵی **١٩٧٥** هاوکات لەگەڵ ڕووخانی ڕژێمی ساگۆن، ڕژێمی ئەمەریکایی لون نول[(٣)] لە کامبۆدیا هەرەسی هێنا. لە لاوسیش ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە حکوومەتی ویـن تیـان رووی داو و کۆنترۆڵی ئەم وڵاتە بەکردەوە لەدەست ئەمەریکا هاتەدەر. خەڵکی مالایا پاش جەنگی دووەمی جیهانی ڕاپەڕین، ڕێکخراوی سیاسی خۆیان ڕێکخستەوە و بە یەکگرتوویی بـەریتانیایان ناچـار کرد، دان بە سەربەخۆیی مالایا بنێ. لە ساڵی **١٩٦٣** فیدراسیۆنی مالیزیا کە وڵاتانی مالایـا، سەنگاپوور و داگیرکراوەکانی پێشووی بەریتانیا لە بـاکووری دوورگـەی ((کـالی مانتـان))[(٤)]ی لەخۆ دەگرت، پێکهـات. بـەهۆی چـەندین کێـشە کـە پاشـان هاتـە پـێش لـە سـاڵی **١٩٦٥** سەنگاپوور لە فیدراسیۆنی ناوبراو هاتەدەر و بووە وڵاتێکی سەربەخۆ. لـە دیـسامبەری **١٩٨٣** بەنێوبژیوانی ئەندونزیا و مالیزیا لە نێوان بـەریتانیا و برۆنـی ڕێککەوتنامەیـەك ئیمـزا کـرا و برۆنی بوونی خۆی وەك دەیەمین وڵاتی سەربەخۆی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ڕاگەیاند.

---

(1) Ibid; P.93.
(2) Socialist Democratic Vietnam.
(3) Lon Nol.
(4) Bedlington, S. S.; Malaysia and Singapore: The Building of New States; Ithaca, N. Y., 1978, pp. 101-105.

# فەسڵی دووەم

## پێشینەی مێژوویی

بێ گومان زانیاری لەسەر گەورەیی مێژووی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا گرینگییەکی زۆری لە ناسینی باشتری ئەم ناوچەدا هەیە. لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەم ناوچەیە هێشتا نەناسراو بوو و یەکەمین ڕۆژئاوایی، کە ڕوویان تێکرد گرووپێکی فەڕەنسی بوون. ئەم گرووپە لە وەسفکردنی کۆشکی پاشای کامبۆدیا ئەو شوێنەیان بە بچووك و کەم بایەخ نیشاندا. ئەوان هەر بەم شێوەیەش چاویان لە پاشای ئەو کاتی کامبۆدیا، نورودوم[1] دەکرد و بڕوایان نەدەکرد، کە نورودوم نەوەی ئەو پاشایانەیە کە بەسەر خەڵکی دەوروبەری پەرستگەی بەشکۆی ئانگوردا حکوومەتیان دەکرد[2].

بەڵام خەڵکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ڕابردووی پڕ لە شانازی و پڕ شکۆی خۆیان لە بیرە و ڕێزی بۆ دادەنێن. دەبێ لە ڕوانگەی ئەوانەوە بڕوانینە ئەم مێژووە هەتا گەورەیی ئەومان بۆ دەرکەوێ (وێنەی١) لەسەر بناغەی ئەو بابەتانەی، کە ڕۆژئاواییەکان پێش لە سەدەی نۆزدەهەم سەبارەت بەوان نووسیویانە.

خەڵکی بێرمە گەورەیی پەرستگەی بەشکۆی پاگانتان بەباشی لە بیرە کە لە سەدەی یازدە و دوازدەهەمدا بینراوە. خەڵکی ئەندونزیاش بەتەواوی ئاگاداری گرینگی مێژووی ئیمپراتۆریی جاوەن. بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، کە دەبێ وەڵامی بدرێتەوە. یەکەم ئەوەی کە بۆچی گەورەترین ئیمپراتۆری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا واتە ئیمپراتۆری ئانگور، لە کۆتاییدا تووشی

(1) Norodom.
(2) Hay, S. N. and M. H. chase, Southeast Asian History: A Bibliographic Guide; New York, 1962.



تاڵترین شکست لە مێژووی ناوچەکەدا بوو و سەرەڕای شاکارە ئەندازیارییەکان و بیناسازی و زانستی تەکنیکی کاتی خۆی وەك ئەندازیاری هایدرۆلیك (ئاودێری) و کۆکردنەوەی سێ جار بەرهەمی برنج لە ماوەی ساڵێکدا بەو شێوەی لەنیوچوو و هەڵوەشایەوە؟




وێنەی (١): ئیمپراتۆری ئانگور لەوپەڕی دەسەڵاتی خۆیدا (سەدەی ١٢ی زاینی)
ناوچەکانی ژێر چاودێری ئیمپراتۆری ئانگور لە سەدەی ١٢ لە سەردەمی سوریا وارمانی دووەم[1] (١١١٣-١١٥٠) و جایاوارمانی حەوتەم[2] (١١٨١-١٢٩١) پێکهاتوو لە کەمبۆدیا، بەشێکی بەربڵاو لە ڤییتنام، باشووری لاوس، هەروەها حکوومەتەکانی جێگیر لە تایلەند و ناوچەی نیمچە دوورگەی تایلەند و مالیزیا.

(1) Surya Varman II
(2) Jayavarman VII.

بۆچی لە سەدەی سێزدەهەمدا ئیمپراتۆری ئاویی-خاکیی شری و جایا (وێنەی٢) پاش چەندین سەدە، کۆنترۆڵی بازرگانی هیندستان و چینی لەدەست دا؟ هەر ئەم پرسیارەش لە پێوەندی لەگەڵ ئیمپراتۆری جاوەشدا هاتووەتە بەرباس.

رەنگە وەڵامی ئەم پرسیارانە بەرواڵەت ئاسان بێ، بەڵام ئەگەر بمانەوێ وەڵامێکی تەواوی پێ بدەینەوە، تارادەیەك مەحاڵە، یان لانیکەم لێرەدا دەرەقانی نییە.






وێنەی (٢): نەخشەی ئیمپراتۆری بازرگانی شری و جایا

زانایان سەبارەت بە هەڵکەوتی ورد و دەقیقی شری و جایا جیاوازی بیروبۆچوونیان هەیە. ئیمپراتۆری گەورەی شری وجایا کۆنترۆڵی بازرگانی نێوان هیندستان و چینی لە سەدەی حەوتەم هەتا سێزدەهەمی زاینی لە ئەستۆ بووە. ئەگەرێکی زۆر لە ئارادایە کە پایتەختەکەی لە باشووری دوورگەی شوماترا بووبێ[1].

(1) Wolters, O. W., The fall of Srivijaya in Malay History; London 1970, pp.83-87.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە و بۆ ئامادەکردنی بوارێك بۆ باسەکانی دوایی پێویستە وێنەیەك لە بارودۆخی گشتی ناوچەکە بکێشین و بەکورتی ئاماژە بە سەرهەڵدان و رووخانی هەریەك لەم ئیمپڕاتۆرییانە بکەین. بۆ ئاسان کردنەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە سەدەی نۆهەم وەك سەرەتایەك لەبەرچاو دەگرین.

لە سەدەی نۆهەم چەندین حکوومەت هەبوون کە هەرکامەیان توانایی جێگای سەرنجیان لە بوارەکانی هونەری و بیناسازی، بەتایبەت لە دروستکردنی پەرستگە و شوێنە مەزهەبییەکان لە خۆیان نیشانداوە، ئیمپڕاتۆری بازرگانی شری و جایا لەم چەشنە حکوومەتانەیە، کە سەرەڕای چەندین شکست هەروا دەسەڵاتی بازرگانی خۆی بەسەر رۆژئاوای (هیندستان) و رۆژهەڵاتی (چین) و بازرگانی خۆجێی نیمچە دوورگەی مالیزی پاراستبوو. ئیمپڕاتۆرییەکانی ئانگور و ((پاگان))یش گرینگییەکی تایبەتییان هەبووە.

لەم سەردەمەدا تەواوی ناوچە لەژێر نفووزی دوو مەزهەبی هاوردەی هیندویزم و بودیزمدا بوون. پەرەئەستاندنی ئەم دوو مەزهەبە گرینگترین ئاڵوگۆڕبوو کە لە سەرەتای سەردەمی مەسیحییەت لە ناوچەی باشووری رۆهەڵاتی ئاسیادا روویدا. بەهۆی بەربڵاوی ئەم ئاڵوگۆڕە، ئەم قۆناغەیان ناونا قۆناغی بەهیندوستانی کردنی ناوچە. سەدەی دووەم و سێهەمی زایینی سەرەتای نفووزی فەرهەنگی هیند لە ناوچەی باشووری رۆهەڵاتی ئاسیا بوو، خێرایی ئەم گۆڕانکارییە لە هەموو شوێنێك وەك یەك نەبوو، چونکە لە هەندێك شوێن کاریگەریی توندی هەبووە و لە هەندێك شوێن کەمتر. وەك ڤییتنام کە لەژێر نفوزی چیندا بوو یان فیلیپین کە مەیلی زۆرتریان بۆ مەسیحییەت نیشاندەدا. فەرهەنگی هیندی لەلایەن بازرگان و زانایانی هیندی بۆ ئەم ناوچەیە راگوێزرا، دیارە هەمووی ئەم فەرهەنگە جێگیر نەبوو، بەڵکو هەندێك لەلایەنەکانی کە لەگەڵ بارودۆخی ناوچەکەدا یەکی دەگرتەوە و پەیوەندی بە رەوشی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی ئەو ناوچەیە بوو، وەردەگیرا دیارە پەرەگرتنی فەرهەنگی هیندی نابێ؛ بەم مانایە لێکبدرێتەوە، کە خەڵکی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا بۆ خۆیان خاوەنی هیچ چەشنە شارستانییەتێك نەبوون. بەڵکو تەشەنەی فەرهەنگی هیندی (مەزهەب و داب و نەریت و...) لەم ناوچەیە بۆ گونجانی ئەم دوو فەرهەنگە لەگەڵ یەکتر و بوونی خاڵی هاوبەشی زۆر دەگەڕێتەوە(1). ئەو بەشە لە تایبەتمەندییەکانی هیندی کە تایبەت بە کۆمەڵگای هیندە، وەك

(1) Coedes, G.; The Indianized States of Southeast Asia, Honolulu, 1968, pp.51-52.



سیستەمی کاست(١) (نیزامی چینایەتی) هیندییەکان لەلایەن خەڵکی ناوچەوە وەرنەگیرا(٢) و ئەو بەشەش، کە وەرگیرا دوای دەستتێوەردانێك بوو کە خەڵکی ناوچە بەپێی سروشتی خۆیان بەکاریان هێنا. بۆ نموونە هەرچەند کەڵکیان لە سەمبولە هونەرییەکانی هیند وەرگرت بەپێی نەریتەکانی خۆیان گۆڕییان و بە فۆڕمی دڵخوازی خۆیان دەریانهێنا. بەکارهێنانی زمانەکانی هیند زۆرتر لە کاروباری حکوومەتی و مەزهەبیدا بوو. فەرمانە ئیدارییەکان و کتێبە دینییەکان بە زمانی سانسکریت دەنووسران، کە ئەمەش بەرەبەرە کەمتر بووەوە، خەڵکی ناوچە لە سەرەتاوە زمانی زگماکی خۆیان پاراست.

خەڵکی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا کەڵکیان لە فەرهەنگی بێگانە وەردەگرت، بەڵام لەگەڵ فەرهەنگی خۆیان هاوسانیان دەکرد. دیارە لە هەندێك بواردا کە زانست و فەرهەنگی ناوچەکە لە ئاستێکی بەرزتردا بوو، ئیتر پێویستی بەوە نەدەکرد کە دەست بۆ بێگانەکان درێژبکەن. بۆ نموونە شێوەی چاندن و کۆکردنەوەی برنج. مەسەلەیەکی دیکە کە دەبێ پێی لەسەر دابگیرێ ئەمەیە کە فەرهەنگی بیگانە بەتایبەت فەرهەنگی هیندی، زۆرتر جێگای سەرنج و قبووڵی کۆشك و حکوومەت بووە هەتا خەڵکی ئاسایی. ئایینی هیندویی و بودایی، بەتایبەت ئاینزای ماهایانا کە لە سەرەتادا ناوچەی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیای داگرت، لەلایەن رێبەران و حکوومەتمەدارانەوە بەمەبەستی خستنە ژێر رکێفی ئەو خەڵکە رەشوکییە کەڵکی لێوەرگیرا و لە دڵەوە بڕوایان بەو شتانە هەبوو و وایاندەزانی روحیانەتەکان لەگەڵ مرۆڤ و شتەکاندا پەیوەندییان هەیە. بە پیرەوەری ئەم خورافاتە بوو کە رێبەران و دەسەڵاتداران بەسەر خەڵکی تێنەگەیشتوودا حکوومەتیان دەکرد و کەڵکیان لە لایەنگری کوێرانەی ئەوان وەردەگرت. هەربۆیە ئەنجامدانی رێوڕەسمە دووروردرێژە مەزهەبییەکان پەرەپێدانی بیروباوەڕی دواکەوتووانە کۆڵەکەکانی حکوومەتیان زیاتر لە پێشوو پتەوتر دەکرد و دەبووە هۆی گەشەی زۆرتری فەرهەنگی هیندو.

لە سەدەی نۆهەمی زایینیدا لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی هیند، لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دوو سیستەمی حکوومەتی پێکهات کە لەڕووی مێژووییەوە هەر کامەیان جێگاو

(1) Caste System.

(٢) سەرنج بدەنە: شاهندەبزاد، ((حکومتهای آمرانه و رشد سریع اقتصادی)) اطلاع سیاسی- اقتصادي، س٦، ش٥١ و ٥٢، ص١٤-١٨.

گرینگییەکی تایبەتیان هەبوو. ئەم دوو سیستەمە بریتی بوون لە حکوومەتی نێو خۆیی ناوچە، کە پێیان دەگوت حکوومەتی ناوچەی وشکارۆیی و پایتەختەکەی ئانگور (کامبودیا) بوو و حکوومەتێك کە لە ناوچەی بەناو ئاوی خاکیی هەڵکەوتبوو و ناوەندەکەی شوێنێك بوو لە دوورگەی شوماترا بەناوی شری وجایا. ئەم دوو حکوومەتە لە بەراورد لەگەڵ حکوومەتەکانی دیکەی پێش خۆیان کە زیاتر مانەوە، نەیانتوانی ماوەیەکی زۆر درێژە بە تەمەنی خۆیان بدەن و هەرەسیان هێنا. ئانگور بەسەر ناوچەیەکی بەربلاو لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا زاڵ بوو و بۆ مانەوە و درێژەی تەمەنی خۆی پێویستی جیددی بە ئاو هەبوو و ئاودێری یەکێك لە کێشە گرینگەکانی بوو. شایانی باسە لە کامبۆدیا سەرەڕای بارینی بارانی بەخوڕ لە هەندێك لە وەرزەکانی ساڵ، زەوی بەخێرایی وشك دەبێ و دوای وەرزی باران، شەش مانگ هاوینێکی وشك بەسەر ناوچەدا زاڵ دەبێ. لەم بارودخەدا تەنیا جێگایەکی لەبار بۆ ژیان لێواری چۆمەکانە و هەرچی لە لێوارەکان دوورتر بکەوێتەوە و بچێتە قووڵایی ئەم ناوچەیە، ژیان سەخت و ئەستەمتر دەبێ. خەڵکی کامبۆدیا بۆ نەهێشتنی ئەم کێشەیە دەستیان بە دروستکردنی ئەنباری گەورەی ئاوکرد. بەم شێوەیە لە وەرزە باراناوییەکاندا ئاویان کۆکردەوە و لە وەرزە وشکەکانی ساڵدا کەڵکیان لێوەردەگرت. ئەم شێوازە هەرچەند لە سەردەمی ئێمەدا ساکار دێتە بەرچاو، بەڵام لە سەدەی نۆهەمی زایینی گۆڕانکارییەکی یەکجار گەورە بوو[1].

خێمێرەکان، واتە خەڵکی ئەو ناوچەیە ئەوەندە لە ئەندازیاری هایدرۆلیك (ئاودێری)دا شارەزاییان پەیداکردبوو، کە بەهۆی ئەوەوە ناوچەیەکی بەربلاویان، کە دواتر بووە ئیمپراتۆرییەکی گەورە، لە وشکانی رزگارکرد و کردیانە ناوچەیەکی سەر سەوز و پڕ پیت و بەرەکەت. لە ناوچەیەك، کە پێشتر هیچی لێ بەرهەم نەدەهات، سێ جار برنجیان لێ بەرهەم دەهێنا و خۆراکی یەك ملیۆن کەسیان دابین دەکرد. کشتوکاڵ ئانگور بواری بۆ بیناکردنی چەندین پەرستگەی گەورە و بە شکۆی ((ئانگوروات))[2] رەخساند. چوار سەدەی خایاند (سەدەی دەهەم تا چواردەهەم) هەتا ئەم پەرستگایانە لە ناوچەیەك بە پانتایی ٣٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە دروستبکرێ. پەرستگەی ئانگوروات لەکاتی پاشای بەدەسەڵاتی کامبۆدیا سوریاوارمانی دووەم بیناکرا. ئانگوروات ٦٦٩ لە ٧٢٦ پێ و بورجەکەی ٢٢٠پێ

(1) Coedes, G., Angkor, An Introdution; London, 1967.
(2) Angkor Wat.



بوو. ئەم بینایە، لە باکووری کامبۆدیا پاش تێپەڕبوونی نزیکەی هەشت سەدە هێشتا سەرسووڕهێنەرە و تاڕادەیەك لەگەڵ یەختی جەمشید بەراورد دەکرێ[1].

ئیمپراتۆری ئانگور لە رێگای شەڕەوە سەروەتێکی یەکجار زۆری بەدەستهێنا و تجارەتێکی بەرچاوی لە ناوچە وەرێخست، بەڵام مانەوە و گەشەی ئانگۆر تەنیا نەبەسترابووەوە بە بازرگانی و شەڕەوە، بەڵکو ئەو پەرستگایانەی کە رێبەرانی ئەم سەرزەوییە بینایان کردبوو، رەواج و دەوڵەمەندی بە مەزهەب بەخشی. ئەو سامانەی کە لە کێڵگە پڕ بەرهەمەکانی برنجەوە بەدەست دەهات تاڕادەیەکی زۆر لە رێگای بەرێوەچوونی رێوڕەسمە مەزهەبییەکان و تەشریفاتی دیکەی ئەو پەرستگایانەی کە لە دەورووبەری ئەم کێڵگانە هەڵکەوتبوون، خەرج دەکرا.

پاش چوونە دەرێ هێزەکانی ڤییتنام لە خاکی کامبۆدیا (١٩٨٩) و هاتنە ئارای بارودۆخێکی تاڕادەیەك ئازاد لە ناوچەدا، کە بوو بەهۆی گەڕانەوەی دووبارەی شازادە نورودوم سیهانوك[2] وەك سەرۆکی وڵات دەرەتانی سەردانی ئەم پەرستگەیە رەخسا. لەم دوایانەدا زانایان بۆیان دەرکەوتووە، کە پەرستگەی گەورەی ئانگوروات بەشێوەیەکی وا دروستکراوە کە لێکۆڵێتنەوە ئەستێرەناسی تێیدا ئەنجامبدرێ. بەجۆرێك وردەکاریی لەدروستکردنی ئەم بینایەدا کراوە کە رەنگە تەنیا یەك لە سەد جیاوازی لە (بەرزی، تیرە، پانی، درێژی) ببینرێ.

شارەزایی ئانگور لە کۆنترۆڵکردنی ئاو و سوود لێوەرگرتنی، نیشانەی تیکنۆلۆژی پێشکەوتووی ئەوە. پێشکەوتن و دەوڵەمەندی فەرهەنگەکەی حاشای لێناکرێ. نوێنەری دەوڵەتی چین، چوتاکوان[3] لە سەردانیدا بۆ ئەم شوێنە دانی بەوەدانا، کە ئانگور دەوڵەمەندترین شاری باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بووە. شایانی باسە کە چینییەکان ئێستاش شارستانیەتی خۆیان وەك ناوەندی شارستانییەتەکانی جیهان دەزانن و بەدەگمەن باسی راستی و دروستی ئەم جۆرە مەسەلانە دەکەن هەروا خۆیان ((بە ئیمپراتۆری ناوەڕاست)) دادەنێن.

ئیمپراتۆری گەورەی ئانگور کە ناوەندە سەرەکییەکەی لە کامبۆدیا بووە، سنوورەکانی ئەو وڵاتەی بەزاند و چەند بەشێکی گەورەی لە تایلەندی ئێستا، لاوس و ڤییتنامی لەخۆ گرتووە. هۆی سەرەکی یەکگرتنی ئەم سەرزەوییانە کاروپیشە و بازرگانی خەڵك نەبوو، بەڵکو

(1) Ibid; pp.97-98.
(2) Prince Norodom Sihanouk.
(3) Chou Ta – Kuan.

دەسەڵات و هێزی پاشای ئانگور بوو، کە ڕێبەران و پاشاکانی پلەی دووی والێکردبوو کە گوێڕایەڵی بن. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم باسانە، کۆڵەکەکانی ئەم ئیمپراتۆرییە گەورەیە سست و لەرزۆك بوو. کاتێك کە پیرۆزی پاشای ئانگور چووە ژێر پرسیار و پاشاکانی سەر زەوییە ژێر دەستەکان کەوتنە بیری سەربەخۆیی، ئەو شکۆمەندییە سیاسییەی نەما. بە لێکترازانی سیاسی، شیرازەی ئیمپراتۆری ئانگور تێکچوو و هەموو شتێك لەوانە سیستەمی ئاودێری کەوتە بەر مەترسی وێران بوونەوە. هەرەسهێنانی ئانگور لە سەدەی پازدەهەمدا خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، واتە گەورەیی و شکۆی لە مێژینە تەواوبوو و قۆناغێکی نوێ دەستیپێکرد.

خەڵکی تایی[1] (دانیشتووانی تایلەندی ئێستا) کەسانێك بوون کە ئانگوریان شکستداو بەرەبەرە کۆنترۆڵی ئەم ناوچەیە واتە تایلەندی ئێستایان بەدەستەوە گرت. ئێرانییەکان لەم گۆڕانکارییەدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو، چونکە کەسانی وەك شێخ ئەحمەدی قومی کە بۆ بازرگانی چووبووە ئەو ناوچەیە، پێی بۆ کۆشکی پاشایەتی کرایەوە و بووە سەرچاوەی خزمەتگوزارییەکی زۆر. خانەدانی ئێرانی بوناك[2] هێشتا لە تایلەند خاوەن پلە و پایەن و وەزیری بەرگری تایلەند (١٩٩٢) لەم بنەماڵە گەورەیەی ئێرانی بوو. ئێرانییەکان مەزهەبی شیعەیان بردە تایلەند و شیعەکانی باشووری تایلەند لەژێر کاریگەریی و نفوزی ئێرانییەکانن[3]. ڤییتنام کە لە ساڵی ٩٣٩ی زایینی پاش هەزار ساڵ لەژێر دەسەڵاتی چین هاتەدەر و سەربەخۆ بوو، ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆی لە ڕووخانی نیزامی ئانگور نەگێڕا، بەڵام ڕووخانی ئانگور بووە هۆی بەهێزبوونی ڤییتنام و بوونی بەهێزێکی گەورە لە ناوچەکەدا.

لە ڕۆژئاوای باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئاڵوگۆڕەکانی کامبۆدیا ڕۆڵی ڕاستەوخۆی لە حکوومەتی بێرمەدا نەبوو. لە نێوان سەدەی یازدەهەم و سێزدەهەم لە بێرمە لە شوێنێك بەناوی پاگان شارێك بینانرا کە تا ساڵی ١٢٨٧ی زایینی هەروا بە شکۆوە. مابووەوە و پاشان بەدەستی مەغۆڵەکان لەنێوچوو.

---

(1) The Thais.
(2) Bunnag.
(٣) بۆ زانیاری زیاتر سەردانی ئەم سەرچاوەیە بکەن: محمد ربیع بن محمد ابراهیم، سفینه سلیمان- سفرنامه سفیر ایران درسیام، تصحیح و تحشیر و تعلیقات عباس فاروقی، انتشارات دانشکاه تهران: ١٣٥٦.



سەرەڕای شکستی ئانگور، فەرهەنگەکەی لەنێو نەچوو و لە حکوومەتەکانی دواییدا وەك حکوومەتی تایبەکان درێژەی بە ژیانی خۆیدا. بیناسازیی تایبەکان، خەت و زمانی تایی، جۆری حکوومەت و تەنانەت جۆری سەماو گۆرانییەکان، هەموویان لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی خێمێر یان کامبۆدیادا بوون.

بێجگە لە دوو ئیمپراتۆریی ئانگور و پاگان، ئیمپراتۆری ئاوی خاکی شری وجایاش شایانی ئەوەیە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ. هەندێك جار بە ئیمپراتۆری دەریایش ناودەبرێ، چونکە لە دەریا نزیك بووە و دەریاش ڕۆڵێکی سەرەکی لە گەورەیی ئەودا گێڕاوە. شری وجایا نیشاندەری بەرزترین ڕێژەی سەرکەوتنە لەنێوان دەسەڵاتە ئاوی و خاکییەکان کە بازرگانییان وەك بنەمایەك دانابوو. دەکرێ لەڕووی شکۆ و گەورەییەوە لەگەڵ ئانگوردا بەراورد بکرێ.

شری وجایا بەپشت بەستن بە چین و پشتیوانی ئەو وڵاتە، سەری هەڵداو توانی لەڕووی بازرگانییەوە گەشە بستێنێ. بازرگانی دەرەکی کە لەمێژووی کۆنی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیادا گرینگییەکی تایبەتی هەبوو، لە ڕاستیدا بازرگانییەك بوو لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە لە چین و هیندستان هەتا ئێران و بەولاوەتر پەرەی ئەستاندبوو. شتومەکی بە نرخ و دەرمانی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئاوریشم و شتومەکی چینیدا... ئاڵوێر دەکرد. لە سەدەی حەوتەم بەشێکی سەرەکی ئەم بازرگانییە لە ئەستۆی خەڵکی مالایی بوو، کە ناوەندی دەسەڵاتەکەی لە شوێنێك لە دوورگەی سۆماترادا بوو. ڕوون نییە خەڵکی مالایی ئەم دەسەڵاتەیان چۆن پەیدا کرد و چۆن توانیان بەسەر شەپۆڵەکانی دەریای باشووری چیندا زاڵ بن. دەریای باشووری چین یەکێك لەو دەریا شەپۆلاوییانەی جیهانە و ئەوەی، کە چۆن مالاییەکان دەیانتوانی بە بەلەمە دارینەکانیان بەربەرەکانێ لەگەڵ شەپۆڵە ترسناکەکانیدا بکەن، جێگای سەرسوڕمانە و هێز و لێهاتووی ئەوان لە سەفەری دەریاکاندا نیشاندەدا لەوەش سەیرتر ئەوەیە چۆن؛ ئەم مەلەوانە کارامانە لە ئاست چەند بەلەمێکی نوێداری بەریتانیاییدا چۆکیان دادا و سەرزەمنەکەیان پێشکەش بەوان کرد. (ڕێگای ئاوی چین هەتا سومەترا کە لە دەریای باشووری چین تێدەپەڕی یەکێك لە ئاستەمترین ڕێگاکانە. هەر کەس شارەزای جوگرافیای ناوچە و وەزعی ئاوەکانی بێ، دەزانێ کە لەم ڕێگا دوور و درێژەدا دوورگەیەکی ئەوتۆ نابینرێ هەتا چاوکار دەکات هەر ئاوە). هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد یەکێك لە گرینگترین هۆکارەکانی بە دەسەڵات گەیشتنی شری وجایا پێوەندی سیاسی ئەم سیستەمە لەگەڵ چین دابوو.

دەسەڵاتدارانی چین بەردەوام وڵاتەکەیان بە سەنتەری جیهان دەزانن و بە زەمانی چینی چۆنگ گۆی پێیان وتووە ((ئیمپراتۆری ناوەڕاست چینییەکان هەتا ماوەیەکی زۆر بە ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیایان دەگوت نن نیگ[1] واتە دەریاکانی باشوور. لە سەرەتادا لە نێوان سەرزەوییەکانی ئەم ناوچەیە تەنیا ڤییتنام لەژێر دەسەڵاتی چین دابوو و پاش ئەوە لە قۆناغی ئیمپراتۆری مەغۆلەکان (١٢٨٠-١٣٦٨) چین هەوڵیدا، کە حکوومەتی خۆی لەسەرتاسەری ناوچەدا پەرە پێبدا. چینییەکان پێیان وابوو؛ خەڵکی دەریاکانی باشوور لە سیستەمی بەڕێوەبەریی کۆنفوسیوس کە چینی بە شکۆ و پلەیەکی بەرز گەیاندبوو، بێ بەش بوون و تەنیا بەلایەنگری لە ئاینییەکانی چین و قبووڵی پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ ئەواندا دەتوانن بە بارودۆخێکی لەبار بگەن. شایانی باسە کە هەبوونی پێوەندیی بە مانای دەسەڵاتی بێ ئەملاو ئەولای چین نەبوو، بەڵکو لە بنەڕەتدا مەسەلەی ئالوویری دەگرتەوە. لەم پێوەندییەدا چین بەرپرس بوو، لەکاتی هەڕەشەکردنی مەترسییەك بۆ یەکێك لە وڵاتانی بەستراوە، یارمەتی ئەو وڵاتە بدا. شری وجایاش بەهۆی مەسەلەی بازرگانی پێوەندی بە چینەوە هەبوو. کاتێك کە شری وجایا بووە یەکێك لە شەریکە تیجارییەکانی چین، پلەیەکی زۆر باشی بەدەستهێنا و وڵاتانی دیکەی ئاوی خاکی لە بارودۆخێکی خراپدا هەڵکەوتبوون. شری وجایا بە پلەیەك کە بەهۆی یارمەتی چین یان بەدەستیهێنابوو و بەو توانایانەی کە لە خۆیدا ڕادەدی، بووە دەسەڵاتێکی گەورە لە ناوچەدا. هەڵکەوتنی لە تەنگەبەری ستراتیژی مالایا بووە هۆی ئەوەی، کە شری وجایا کۆنترۆڵی تەواوی بەسەر بازرگانی دەریاکانی ڕۆژئاوای نیمچە دوورگەی ئەندونزیا و ناوچەی باشووری چین ببێ، ئەگەر وڵاتێك بیویستایە دەستدرێژی بکاتە سەر شری وجایا لەلایەن چینەوە بەتوندی سزا دەدرا.

شری وجایا وەك ئانگور بەسەر کێشە و گیروگرفتەکانی خۆی زاڵ ببوو و وەك خێمێر لە ئانگور بە کۆمەکی ئەندازیاریی هایدرۆلیك توانیبووی ناوچەیەکی وشك و بێ بەرهەم بکاتە ناوچەیەکی کشتوکاڵی پڕ بەرهەم. لە شری وجایادا، دەوڵەتی مالایا کەڵکی لە ئیمتیازی خۆی کە بوونی سنووری دەریاییەکان (لێوارەی ڕۆژئاوای مالیزیا) بوو، وەرگرت. ئەو ئەرکەی کە شری وجایا لە سەدەی حەوتەم هەتا چواردەهەمدا لە کۆنترۆڵی هێڵە بازرگانییەکانی ناوچەی لەسەر شانی بوو،

(1) Nanyang.



دواتر گوازرایەوە بۆ حکوومەتی مالاکا (ئەمیرنشینی مالاکا، یەکەمین حکوومەتی ئیسلامی لە ناوچە) و لە سەدەی نۆزدەهەم کەوتە سەرشانی سەنگاپوور. شری وجایا یەکەمین دەسەڵات بوو کە نیشانیدا زاڵبوون بەسەر دەریاکاندا دەتوانێ ڕۆڵێکی گرینگ لە هێز و دەسەڵاتی وڵاتێکدا بگێڕێ. سەنگاپوور کە ئەمڕۆ وەك ئەنباری ناوچە سەیر دەکرێ[1]، بە کردەوە شوێنکەوتووی حکوومەتی شری وجایا لە شەش سەدەی لەمەوپێشەوە بووە[٢] و سەیر ئەوەیە کە پاپۆڕەکانی پورتوگالی، هۆڵەندی و بەریتانیایی کە وەك بازرگان هاتبوونە ناوچەکە بۆیان دەرکەوت، کە ئەوان لەجێی هێزی بازرگانیی ناوچە، واتە ئیمپراتۆری شری وجایان، بەکردەوە بێ ئەوەی بزانن کەڵکیان لەو شێوە بازرگانییە وەردەگرت.

لە سەدەی سێزدەهەمدا شری وجایا شاهیدی گۆڕانکاری گەورە و چارەنووسساز بوون. کاتێك کە چین دەستی دایە بازرگانی ڕاستەوخۆ لە ناوچەدا، بووە هۆی گۆڕانکارییەکی گەورە لە ئیمپراتۆری شری وجایا. بە سەرهەڵدانی دەسەڵاتەکانی دیکە لەناوچەدا وەك ئەندونزیاییەکان کە بەدوای فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بوون، ژیانی شری وجایا کەوتە مەترسی جددیەوە. حکوومەتەکانی جێگیر لە جاوە کەڵکیان لە لاوازی شری وجایا وەرگرت و جموجولی توندیان دژی دەستپێکرد و سەرئەنجام لە کۆتایی سەدەی چواردەهەمدا حکوومەتی شری و جایا بە تەواوی هەرەسی هێناو لە نێوچوو.

سەبارەت بە ڤییتنام پێویستە ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەین: ڤیەتنام لە چاو بەشەکانی دیکەی ناوچە کەمتر کەوتبووە ژێر کاریگەری چینەوە. بەڵام بەهەرحاڵ مێژووی ڤییتنامیش بەبێ ئاڵۆزی و شەڕوپێکدادان لەگەڵ کۆنە ئاغاکەی خۆی (چین)، نەبووە[٣]. مێژوو نیشانی داوە کە لە نێوان چینییەکان و غەیرە چینییەکان هەموو کاتێك ناکۆکی بووە. نموونەیەکی هەرە بەرچاو، دەرکرانی چینییەکان لە ڤییتنامە کە پاش تێکچوونی پێوەندی دوو وڵاتی کۆماری سوسیالیستی ڤییتنام و کۆماری گەلی چین لە ساڵی ١٩٧٩ ڕوویدا. ڤییتنامییەکان بەدرێژایی

(1) regional entrepot.

(٢) سەنگاپوور کەرەستەی خاوی لە شوێنەکانی دیکە بوونە نەوت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکرێ و بە پالفتەکراوی دەیگەیەنێتە بازاڕە خۆجێیەکان.

(3) Wood side, A. B. vietnam and the chiness Modd Combridge, Mass, 1971, p.90.

مێژووی ئەم وڵاتە بەردەوام لەگەڵ کۆچبەرانی چینی و هەڵگرانی فەرهەنگی چینی لە شەڕدابوون. پێگەو پلەی ژن لە کۆمەڵگای ڤییتنام (بێجگە لە کۆشکی پاشایەتی کە لەژێر کاریگەری ڕێنوێنییەکانی کۆنفوسیوسدا بوون) لەگەڵ پێگەی ژن لە چین بە تەواوی جیاوازە، هەروەها زمان و داب و نەریتی ڤییتنامی لەگەڵ زمان و داب و نەریتی چینی جیاوازی بەرچاویان هەیە. بەشێوەی گشتی، پێکهاتەی فەرهەنگی ڤییتنام لەگەڵ فەرهەنگی چین جیاوازە و زیاتر لەگەڵ فەرهەنگی ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هاوبەش و وێکچوون. سەرەڕای ئەمانە ناکرێ حاشا لە کاریگەری ئامۆژگاری چینییەکان بەتایبەت لە ئاستی کۆشکی پاشایەتیدا بکەین. چین بۆ ڕێبەرە ڤییتنامییەکان سەمبولێك بوو، کە بۆ ماوەی هەزار ساڵ لاساییان دەکردەوە.

ڤییتنام بەڕابردوویکی جیاواز لە وڵاتانی دیکەی ناوچەکە لەژێر کاریگەری فەرهەنگی هینددا بوون لە مێژووەکەیدا بەشێکی سەرەکیی هەیە. لە کۆتایی قۆناغی کلاسیکدا ڤییتنام بووە دەسەڵاتێکی گەورە و بە لەنێوبردنی چامپا(١)، دراوسێی باشووری خۆی، بووە خاوەن دەسەڵات(٢). چامپا وڵاتێك بوو لەژێر کاریگەری فەرهەنگی هاوردەیی هندودا سەردەمێك توانیبووی دەسەڵاتی گەورەی ناوچە، واتە ئانگور بەشێوەی جیددی بخاتە مەترسییەوە و پاشان لە کۆتایی سەدەی دوازدەهەم بۆ ماوەی کاتیی دەستی بەسەردا بگرێ. لە سەدەکانی سەدەی چواردەهەمدا دەسەڵاتی پێشووی چامپا ڕووی لە کزیدا و سەرئەنجام بەدەست ڤییتنامییەکان کە ڕەوتێکی دەسەڵاتخوازانەیان دەستپێکردووە لەنێوچوو.

ئاڵوگۆڕە گەورە و یەك لە دوای یەکەکانی ناوچە لە سەدەی سێزدەهەم هەتا پازدەهەم، مێژوونووسانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە کردووەتەوە، کە ئایا ئەو ئاڵوگۆڕ و ڕووداوانە بە مانای کۆتایی قۆناغی کلاسیك و سەرەتای قۆناغێکی نوێ نییە. ڕووخانی سیستەمە گەورەکان و سەرهەڵدانی وڵاتانی نوێ ڕۆڵێکی گرینگی لە مێژووی ناوچەدا گێڕاوە، وەك سەرهەڵدانی ئیمپڕاتۆری مەغوول (یوان) لە چین کە گرینگییەکی تایبەتی هەیە. ئیمپڕاتۆری یوان بە لەنێوبردنی حکوومەتی پاگان لە بێرمە و دەستتێوەردان لە کاروباری ئەندونزیا، ڤییتنام، چامپاو کامبۆدیا هەلومەرجێکی ناسەقامگرتووی لەو ناوچەیەدا پێکهێنا و بووە هۆی خولقانی گۆڕانکاری گەورە. هەندێك لە کارناسان ئەم گۆڕانکارییە گەورانە

(1) Champa.
(2) Chandler, D.P, A History of combodia, Boulder, Colorado, 1983, p.123.



بەسەرچاوەی سەرهەڵدانی بورسیمی تراوادا لە ناوچەی وشکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و دینی ئیسلام لە ناوچەی ئاوی خاکیی دەزانن، بەشێوەی گشتی ئەو زنجیرە ئاڵوگۆڕانە کە هاوکات، بەڵام بەجیا لە ناوچەدا ڕوویاندا، قۆناغێکی نوێی هێنایەکایەوە. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەوڵێکی بەرفراوانی درا تا هۆکاری سەرەکی ڕووخانی ئیمپڕاتۆریەتی ئانگور دەستنیشان بکەن. بورسیمی تراوادا، لە هیندوسیم و بورسیمی ماهایانا(١) دیموکراتیکتر بوو ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی ئەم دۆخە، هەروەها یەکێکە لە هۆکارەکانی دروستبوونی گۆڕانکاری گەورە و سەرهەڵدانی قۆناغێکی نوێ. ڕەنگە هۆیەکی دیکە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و مالاریا، کە پاش پەلاماری تاییەکان و ڕووخانی سیستەمی ئەندازیاری هایدرۆلیکی ئانگور و پێکهێنانی حەوزی گەورەی وەستا و بێ.

بەهەر حاڵ بەدرێژایی دوو سەدە، گۆڕانکاری و وەرچەرخانی گەورە لە ناوچە ڕوویدا، کە دەوڵەتە کۆنەکان توانای بەربەرەکانێیان لەگەڵیدا نەبوو و لە ئاکامدا دەوڵەتە نوێیەکان کە خۆیان لەگەڵ هەلومەرجی ئەوکات گونجاندبوو، دروستبوون. لە کۆتاییدا دەبێ پێ لەسەر ئەوە دابگیرێ کە قۆناغی نوێ لەگەڵ قۆناغی کۆن بە تەواوی پێکەوە گرێدراو و بە کردەوە میراتگری ئەوە و ناکرێ ئەم دووانە لە یەك جیابکرێنەوە.

(1) Mahayana Buddhism.

# فەسڵی سێهەم

## باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەر لە هێرش و دەسەڵاتی ئەوروپا

مێژوونووسان لە هەوراز و نشێوی مێژووی هەر ناوچەیەکدا بەردەوام بەدوای خاڵە وەرچەرخانەکاندا دەگەڕێن، کە بتوانن بیکەنە بناغەیەك بۆ ئاڵوگۆڕە مێژووییەکان. دەستپێکردنی قۆناغێك و کۆتایی قۆناغێکی دیکە لێکۆڵەرانی هێناوەتە سەر ئەو بڕوایە، کە بۆ هەر گۆڕانکارییەك بەدوای سەرەتا و کۆتایی دابن، کە هەندێك جار لەگەڵ ڕاستییەکان یەك ناگرنەوە و سیمایەکی ناڕاست پێشاندەدەن.

لە فەسڵی پێشوودا بە دووروردرێژی سەبارەت بە رووخانی ئیمپڕاتۆرییە گەورەکانی ناوچە وشکاڕۆییەکان و ناوچە ئاوی-خاکییەکان دواین. دیارە لەنێوچوونی ئەم حکوومەتانە بەو مانایە نییە، کە خەڵکی ئەم سەرزەوییانە گەورەیی و شکۆی رابردووی خۆیان لەبیرکردنی و لەژێر کاریگەری ئەودا نەبن، یان پاشا و دەسەڵاتدارە نوێیەکان بەلاوازتر لە پاشاکانی پاگان، ئانگور و شری وجایا بزانن. مەسەلەیەك کە پێویست بە ئاماژەکردنە ئەوەیە، کە ڕێبەرانی وڵاتانی هەتا سەدەی هەژدەهەم زیاتر کونەپارێزبوون و تەمەنی حکوومەتەکانیان درێژتر بوو. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە سەدەی هەژدەهەم گرینگییەکی تایبەتی بووە، چونکە سەرەتای ئاڵوگۆڕێکە کە بە هێرشی ڕۆژئاواییەکان دەستپێدەکا و لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەوپەڕی خۆی دەگا.

لە سەدەی هەژدەهەمدا بەجێگای ئەو دە وڵاتەی کە ئێستا ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیایان پێکهێناوە، لەم ناوچەیە چل وڵاتی سەربەخۆ یان بەڕواڵەت سەربەخۆ هەبوون کە زۆربەیان بایەخێکی ئەوتۆیان نەبووە. مەسەلەیەکی دیکە لە سەدەی هەژدەهەمدا ئەوەیە کە کۆلۆنیالیزم لەم ناوچەیەدا بەشدارییەکی بەرچاوی نەبووە، بێجگە لە دوورگەکانی باکووری





فیلیپین و بەشێکی گەورە لە جاوە کولونیالیزمی ڕۆژئاوایی لێنەبووە. بەر لە دەسەڵاتی ڕۆژئاوا، ڤییتنام هەڵکەوتووترین حکوومەتی ناوچە بوو.

لە سەدەی هەژدەهەمدا، ڤییتنام لەڕووی سیاسییەوە خاوەنی دوو بەشی جیاوازی باکوور و باشوور بووە و لەهەر بەشێکدا حکوومەتێکی سەربەخۆی لێبووە. سەرەڕای پەلامارە دەرەکییەکان و شۆڕشە نێوخۆییەکان کە لە سێ دەیەی کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا رووی داوە، ڤییتنام هەروا، بە دوو بەشی ماوەتەوە. لەو سەردەمەدا ئەمە بۆ ڤییتنام حکوومەتێکی دڵخواز بوو کە لەسەر بنەمای ئامۆژگارییەکانی کۆنفوسیوس، زانای گەورەی چین دامەزرابێ و سیستەمی ئیداری چین بکاتە سەر مەشقی خۆی. ئەمە بەو مانایە نییە، کە ئەم وڵاتە بە تەواوی شوێنکەوتووی سیستەمی بەڕێوەبەری چین بوون، چونکە ڕێبەرانی ڤییتنام هەرچەندە چینیان وەك سەمبولی خۆیان دەزانی، بەڵام سەلیقەی تایبەت بەخۆیان لە بەڕێوەبردنی حکوومەتدا بەکاردەهێنا. ڤییتنام سەرەڕای ئەوەی کە بۆ چین وەفادار بوو، بەڵام ئیزنی نەدەدا کە چین دەست لە کاروباری نێوخۆیی ئەو وەربدا. بەهەرحاڵ بەهۆی کارتێکردنی چین، حکوومەت و ڕێکخراوە ئیدارییەکانی ڤییتنام لەگەڵ ولاتانی دیکەی ناوچەدا جیاوازی هەبوو. بۆ وێنە، لە ڤییتنامدا هەموو ئەو کەسانەی کە لە تاقیکردنەوەکاندا دەردەچوون، دەیانتوانی بچنە نێو سیستەمی بەڕێوەبەری ئەو وڵاتەوە. لە حکوومەتە پاشایەتییەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە لایەنگری مەزهەبی بوودا بوون (بێرمە، تایلەند، کامبۆدیا و ناوچەیەك کە لاوسی ئێستا تێدا هەڵکەوتووە) کارکردن لە سیستەمی بەڕێوەبەریدا بەشێوەی نیمچە میراتگرانە بوو. لەم وڵاتانەدا منداڵی بەرپرسێکی دەوڵەتی بوون، مەرجێکی پێویست بوو بۆ وەرگرتنیان لە دەزگا دەوڵەتییەکان، بەڵام لە ڤییتنام بە پێرەوی کردن لە چین مەرج لێوەشاوەیی خەڵك بوو و هەموو دەیانتوانی بە نیشاندانی لێوەشاوەیی خۆیان کە لە تاقیکارییە دەوڵەتییەکاندا دیاریدەکرا بچنە نێو دەزگا دەوڵەتییەکانەوە. دیارە بەکردەوە تەنیا کەسانێك دەیانتوانی ئەم تاقیکارییانە ئەنجامبدەن کە خاوەنی ئیمکاناتی ماڵی زۆر و دەست ڕاگەیشتن بە مامۆستا و پسپۆڕی بوارە جۆراوجۆرەکان بوونایە. لە ڤییتنام بەرپرسانی دەوڵەتی، ڕاوێژکاری ئیمپڕاتۆربوون، واتە ئەو کەسەی خۆی بە ڕۆڵەی ئاسمانەکان دەزانێ و وەك پردی پێوەندی نێوان زەوین و ئاسمان چاو لێدەکرا. بیروکراتی ڤییتنام برۆکراتیەتی هێرەمی بوو کە پاشا لە لوتکەی ئەو هێرەمەدا بوو و هێڵە پێوەندییەکانی نێوان ئاستە جۆراوجۆرەکانیان زۆر ورد دیاری کردبوو.

یاساکانیان بەشێوەی نووسراو بوون و هەموو بابەتە حکوومەتی و ئیدارییەکانی لەخۆدەگرت، بەشێوەیەك کە بیروکراتییەکی بەربڵاویان پێکهێنابوو.

دەسەڵاتی فەرهەنگی هیند لە وڵاتانی تایلەند، بێرمە، کامبۆدیا و لاوس دیار نەبوو[١]. لەم وڵاتانەدا زنجیرەی بەرپرسایەتییەکان لە هەندێك بواردا زۆر ئاڵۆز بوو، چونکە ئەرکی تاکەکان و پێوەندی نێوان ئاستە جیاوازەکان ناڕوون و دیاری نەکراو بوو. بۆ وێنە بە پێچەوانەی سیستەمی حکوومەتی ڤییتنام، کە لە بەرزترین ئاست تا خوارووترین ئاست چاوەدێری ورد و دەقیقی لەسەربوو، لە وڵاتانی ژێر نفووزی فەرهەنگی هینددا چاوەدێرییەکی ڕێکوپێك لە ئارادا نەبووە و ئیدارەی کاروبارەکانی ناوچە دووردەستەکان بە ڕەزامەندی و چاودێری بەرپرسانی سەرەوەتر، دەدرایە ئوستاندارەکان یان فەرمانداراەکان (قائیممەقامەکان)، بەمەرجێك بە ڕێکوپێکی باج و خەراجی خۆیان بدەن. ئەگەر هێرەمی بوونی سیستەمی بەڕێوەبەری و حکوومەتی ڤییتنام لەبەرچاو بگرین، سەبارەت بەو وڵاتانەی کە پێڕەوی لە فەرهەنگی هیند دەکەن دەبێ، وەك چەندین بازنە سەیری بکەین کە بە پێڕەوی کردن لە ناوەندییەکی سەرەکیی بە نەزمێکی گشتی لە تەنیشت یەك ڕاگیراون. هەر کام لەم بازنانە نیشاندەری دەسەڵاتێکی ناوچەیی بوون و بازنەی ناوەندی، کە دەسەڵات و ڕێبەری بێ ئەم لاوئەولای لەدەستدابوو، ئەوانی پێکەوە دەبەستەوە. دەسەڵاتی پاشا زیاتر لە چوارچێوەی ئەم بازنە بچووکەدا بووە و لە ئاستەکانی خوارووتردا بەهۆی ئەو نوێنەرانەی کە خۆی دیاری کردبوون، ئەم دەسەڵاتە بەڕێوەدەچوو (هەندێك لە شارەزایان دان بەوەدا نانێن کە شێوەی دەسەڵاتی ئەمڕۆیی لە سەدەی هەژدەهەمدا هەبووبێ)[٢]. ئەوانەی لە لوتکەی دەسەڵاتداربوون کەسانێك نەبوون کە بەهۆی لێوەشاوەیی خۆیانەوە بە دەسەڵات گەیشتبێتن، بەڵکو لەدایکبوون لە بنەماڵە خاوەن دەسەڵات و پایە بەرزەکان و ڕاکێشانی سەرنجی پاشا لە پێشکەوتنی تاکەکاندا زیاتر لە هەموو شتێك ڕۆڵی سەرەکی گێڕاوە.

بۆ ڕوونبوونەوەی ئەم باسە، بەراوردێك لەنێوان حکوومەتی پاشایەتی تایلەند و ڤییتنامدا دەکەین. پاشای تایلەند وەکو پاشای ڤییتنام پڕوی پێوەندی نێوان زەوین و ئاسمان بوو. لە تایلەند و وڵاتانی دیکەی لایەنگری فەرهەنگی هیند، پێگەی پاشا بەجۆرێك بووە، کە سەرەڕای پیرۆزبوونی پلەکەی، وەك قورسایی ناوەندی دەسەڵات چاوی لێدەکرا، بەڵام لە ڤییتنامدا، شا بە بوونی پلەی ڕۆڵەی ئاسمان، دەسەڵاتی سەرزەوییەکەی بەرتەسك بوو و دۆخێکی وای نەبوو. لە ڤییتنامدا، بوونی ئیمپڕاتۆر بۆ پاراستنی دەسەڵات گرینگییەکی چارەنووسسازی بووە، بەڵام بۆخۆی بە تەنیایی وەك سەمبولّی ژیانی نیشتمان چاو لێنەدەکرا، هەربۆیە خەڵکی ڤییتنام بۆ ماوەی سەد ساڵ (سەدەی حەڤدەهەم هەتا هەژدەهەم) سیستەمێکیان قبوولکردبوو تێیدا پلەی پاشایەتی تەنیا شتێکی سەمبولّی بوو و لەڕووی ڕابەرایەتی کردندا لەگەڵ کەسانی دیکە بەرامبەر بووە. سەرەڕای ئەمانە، لە ڤییتنامدا چەمکی وڵات بە مانای ئەمرییەکەی واتە سیستەمێکی حکوومەتی بە زنجیرە بەرپرسایەتییەکی تایبەتەوە هاتە ئاراوە، بەڵام لە وڵاتانی ژێر کاریگەری دەسەڵاتی فەرهەنگی هیند خاوەنی ئەم تایبەتمەندییە نەبوون و وڵات بەم نێوەڕۆکەوە لای ئەوان بوونێکی ڕاستەقینەی نەبووە. شارستانییەتی ڤییتنام لەم ڕووەوە وەك شارستانییەتێکی پێشڕەو ناسراوە. لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، تەواوی ڕێبەرانی وڵاتانی بوودایی، وەك کەسانێکی پیرۆز یان نیمچە پیرۆز چاو لێدەکران و جێگای ڕێزی هاووڵاتییانی خۆیان بوون. پیرۆزی ئەم ڕێبەرانە زیاتر بەهۆی توانایی گەلێکی تایبەتییەوە بوو، کە دەدرایە پاڵیان و ئەم کارە تایبەتمەندییەکی سەرووتر لە ئینسانی پێ بەخشیبوون. لەم ڕووەوە ناتوانرێ پیرۆزی ڕێبەرانی بوودایی لەگەڵ پیرۆزی ڕێبەرانی مەسیحی لە ئەوروپا بەراورد بکرێ. چونکە ڕێبەران و دەسەڵاتدارانی بوودایی خۆیان بە نوێنەری مەزهەبیش دادەنا و فەرمانبەریی خەڵکیان وەك ئەرك دەزانی. ئەگەر کەسێك ببوایە بە ڕێبەری وڵات خۆی بە میراتگری هەموو دەسەڵات و بەها پیرۆزەکان دەزانی، وەك بڵێی هەموو کاتێك خاوەنی ئەم پیرۆزییە بووە و کەسی پێشوو بەناڕەوا مافەکەی لێ زەوت کردووە. گرینگی ئەم نەریتە مێژووییە لە مێژووی ئەمڕۆی ناوچە بە تەواوی دەرکەوتووە، چونکە پیرۆزی و گەورەیی پێگەی ڕێبەرانی زنجیرەی چاکری بووە هۆی ئەوەی کە پاشاکانی تایلەند هێشتاش خاوەنی دەسەڵات و ڕێزێکی زۆر بن. لە حکوومەتی تایلەندا، کە پاش شۆڕشی ١٩٣٢ بووە مەشرووتەی پاشایەتی، ئەم نەریتە زاڵبوو کە پاشا هەموو کاتێك ڕۆڵی پشتی پەردەی هەبێ. کامبۆدیا نموونەیەکی دیکەی دەسەڵاتی پاشاکانی بوودایی بووە.

شازادە نورودوم سیهانوك، ڕێبەری ئێستای حکوومەتی کاتی کامبۆدیایە. ناوبراو بەدرێژایی داگیرکەرانی وڵاتەکەی بەدەستی هێزە ڤییتنامییەکان و پێش لەو بەدەستی



(1) The Indianized States of Southeast Asia, P.90.

(2) Shrieke. J. O., Indonesian Sociological Studies, Part two, the Hague, 1957, p.44.

هاوپەیمانی ئەمریکا واتە رژێمی لون نول، دوورخرابووەوە، بەڵام بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەموو کاتێك جێگای رێزی خەڵك بوو، ئەگەر دەستتێوەردانی دەرەکی (ئەمەریکا، سۆڤییەتی پێشوو و ڤییتنام) نەبووایە دەیتوانی بەردەوام بێ لە رێبەری کردنی وڵاتەکەیدا. ناوبراو پێش لە وەرگرتنی پۆستی سەرۆك کۆماری (لە ساڵی ١٩٥٥) پاشای وڵات بوو و لەهەر حاڵدا خاوەنی پیرۆزییەکە کە تا کۆتایی تەمەنی لەگەڵیدا دەبێ.

بەرپرسانی پاشایەتی لە وڵاتە ئاوی-خاکییەکانیش رۆڵێکی گرینگیان گێڕاوە. دەسەڵاتدارە ئاماژەپێکراوەکانی سەرجەمی ئەم وڵاتانە، بێجگە لە ڤییتنام، زۆربەیان لایەنگری دینی ئیسلام بوون و وەك حاکمی ئیسلامی و رێبەری دینی فەرمانڕەواییان کردووە. بەپێی ئامۆژگارییەکانی ئیسلام رێبەرانی ئەم وڵاتانە دەبێ خۆیان لە خەڵکی تر جیانەکردنەوە، بەڵام ئەم بڕوا ئیسلامییە بەکردەوە لەبەرچاو نەگیرا. چونکە وڵاتانی ئاماژە پێکراو لە رابردوودا لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی هینددا بوون و زۆرتر ئیسلامیان لەگەڵ بیرۆکەی هیندی رێکخستبوو. باشترین نموونە لەم پێوەندییەدا وڵاتی جاوەی ئیسلامییە  کە پێش لە حکوومەتی ئێستای وڵاتی ئەندونزیا بوونی هەبووە. رێبەرانی حکوومەتی ناوەندی جاوە، زنجیرەی ماتارام[1] هەموویان پێڕەوییان لە ئایینی ئیسلام کردووە، بەڵام لە هەمان کاتدا میراتگری سوننەتیی سێحر و جادووی بەجێماو لە هیندویزم و بوودیزمیش بوون. ئەوان هەمان ئەو پیرۆزییە ئاسمانییان مابوو کە لە ئیسلامدا حاشای لێکراوە. چونکە دینی ئیسلام هەموو کەس بە بەرامبەر دەزانێ و تەنانەت حەزرەتی موحەممەد (د.خ) خۆی وەك کەسانی دیکە دەزانی. رێبەرانی ماتارام هەر چەند بەڕواڵەت حاشایان لە بەرامبەری خۆیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا نەدەکرد، لە کردەوەدا بەپێچەوانەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. دیارە خەڵکیش ئەم کەشە نابەرامبەرەیان قبووڵکردبوو کە لەم بوارەدا کاریگەری خۆیان داناوە.

بەشێوەی گشتی لە سەدەی هەژدەهەمدا، رێبەران و کاربەدەستانی حکوومەتی ناوچەی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا، چینێکی بە تەواوی جیاواز لە خەڵك بوون. تەنانەت لە ڤییتنامی بەڕواڵەت دیموکراتیکیشدا کەسێکی ئاسایی، کە پاش سەڵماندنی لێوەشاوەیی لە تاقیکاری گرینگی ماندارین و بەدەستهێنانی بەرپرسایەتییەکی دەوڵەتی، دەچووە نێو چینی گەورە

(1) Mataram.



پیاوانەوە، بە چەشنێك هەڵسوکەوتی دەکرد، کە دەتگوت هیچ کاتێك لە چینی خوارەوەی کۆمەڵ نەژیاوە. مەودای نێوان خەڵك و چینی دەسەڵاتدار بەڕادەیەك زۆر بوون کە تەنیا هەندێك جار ئەویش لەلایەن کەسانێکی تایبەتییەوە ئیمکانی کەمکردنەوەی ئەم مەودایە هەبووە. شایانی باسە کە خەڵکی ئاسایی مەودای نێوان خۆیان و چینی هەڵبژاردەی (رێبەران و بەرپرسانی دەزگا حکوومەتییەکان) یان قبوڵکردبوو، چونکە بە نەریتێکی ئایینییان دەزانی و تەنانەت هەوڵیاندەدا بیانپارێزن. مەزهەب، چینییە جۆراوجۆرەکانی پێکەوە دەبەستەوە، چونکە زۆرجار رێبەرانی وڵات، ئەرکی رێبەری کردنی مەزهەبیشیان لە ئەستۆ بوو، خەڵك پلەوپایەی ئاسمانی ئەوانیان قبوڵکردبوو و عاشقانە خۆشیان دەویستن. بۆ تێگەیشتنی ئەم باسە پێویستە سەرنج بدەینە ئەم رستەیە کە لە وڵاتی بێرمە زۆر باوە: ((بێرمەیی بوون واتە بوودایی بوون)). لە بێرمە، پاشا سەروەری مەزهەبی خەڵك بوو، هەر بۆیە پەیڕەوی کردن لەو نە تەنیا وەك ئەرك، بەڵکو وەك کارێکی پێویستی لێهاتبوو. سەرەڕای ئەمەش بەر لە سەدەی هەژدەهەم چینی سێهەم لە نێوان نوخبەکان و خەڵکی ئاساییدا نەبوو، هەتا هاوسەنگییەك لە پێوەندی نێوان ئەم دوو چینەدا پێکدێنێ.

پێکهاتەی نەریتی ناوچە هەتا سەدەی هەژدەهەم کە خاڵێکی وەرچەرخانە لە مێژووی ناوچەکەدا، بە کردەوە وەك خۆی مایەوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە، کە رۆژئاواییەکان پێیان نەنابێتە ئەم ناوچەیە. ئەوان پێش ئەم سەدەیە بەرەبەرە هاتوونەتە ناوچە و دەستیان لە کاروبارە جۆراوجۆرەکانی وەرداوە و تەنانەت ناوی فیلیپین دروستکراوەی ئەوانە و لە ناوی پاشای ئیسپانیا، فیلیپی دووەمەوە[1]، هاتووە. چونکە ئیسپانیا لەم وڵاتەدا دەورێکی دیاریکراوی هەبووە. هەروەها پورتوگال، ئیسپانیا و هۆڵەندا چەند وڵاتێکی دیکە بوون کە لە مێژووی ئەم ناوچەیەدا رۆڵێکی گرینگیان گێڕاوە.

لە سەدەی شازدەهەم پورتوگال یەکەمین وڵات بوو کە پێی نایە ناوچەکە، بووە دەسەڵاتی بێ ئەملاو ئەولای ناوچە کۆنترۆڵی تیجارەتی بەهاراتی، کە لە بنەڕەتدا هۆی راکێشانی ئەوان بۆ ناوچە بوو، بە تەواوی گرتە دەست. پێشکەوتنی خێرای پورتوگال لە ناوچەدا، کە بەداگیرکردنی مالاکا لە ساڵی ١٥١١ کامڵ بوو، سەرئەنجام بووە سەرهەڵدانی بەهێزی هۆڵەندا وەك

(1) Phillip the Second.

گرینگترین وڵاتی تیجاری ئەورووپا لەسەر زەوی مالی و ئەندونزیادا. بازرگانە هۆڵەندییەکان کە پێشتر لە جاوە و باتاویا (جاکارتا)[1] نیشتەجێ بوون، بەتوندی کەوتنە ژێر کاریگەری بایەخە نەریتەکانی ئەندونزیا. بەڵام سەبارەت بە خەڵکی فیلیپین و داگیرکەرانی ئیسپانیایی بارودۆخەکە بەم شێوەیە نەبوو، چونکە لە ڕوانگەی هەندێك کەس، فیلیپین وەك لاپەڕەیەکی سپی وابوو، کە دەیانتوانی هەر نەخشێکی لەسەر بکێشن و داگیرکەرانی ئیسپانیای ئەو کارەیان کرد. هێشتاش ئاسەواریان لە کۆمەڵگای فیلیپیندا بەڕوونی و راشکاوی دیارە. ئیسپانیاییەکان چوونە ناوچەیەکەوە کە حکوومەتێکی سەقامگیری نەبوو و خەڵك بەشێوەی پرش و بڵاو و بەبێ هیچ ڕێکخستنێکی ڕێکوپێك دەژیان. تەنیا بە دوورگەکانی باشووری ئەو وڵاتەدا، کە ئیسلام ببووە هۆی یەکیەتییان، حکوومەتگەلێکی ڕێکخراوی ئیسلامی هەبوون.

لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەهەمدا ئیسلام بەرەبەرە چووە ناوچەی باکووری فیلیپین و تەنانەت مانیلی گرتەوە. بەڵام نفووزی ئیسلام لەم دوورگەیە تەنیا لە لێوارەکانی ناوچەدا بوو و ناوچەکانی ناوەند وەك خۆیان مابوونەوە و بەهۆی دواکەوتوویی خەڵکی ئەم بەشانە، ئیسپانیا توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ. بەلایەنگری ڕێبەرانی عەشیرەکان لە سیاسەتی داگیرکەرانەی ئیسپانیا ڕێگای نفووزی ئەم وڵاتەی لە فیلیپین خۆشترکرد. بە پێچەوانەی ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە سەرباز و میلیتارەکان، پەرەیان بە کۆلۆنیالیزم دا لە فلیپین. بانگەشەکەرانی مەزهەبی ئاڵاهەڵگری کۆلۆنیالیزمی ئیسپانیا بوون. رژێمێك کە لە فیلیپین پێی گرت ریژێمێك بوو کە لەودا کلێسە و حکوومەت یەك بوون، بە بۆچوونی هەندێك لەو لێکۆڵەرانەی کە شارەزای مەسەلەکانی پێوەندیدار بە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیان، بەخوێندنەوەی ئەزموونەکانی ئیسپانیا لە ئەمەریکای لاتین باشتر دەتوانن شارەزای سیاسەتەکانی ئیسپانیا لە فیلیپین بین. کاریگەریی بایەخەکانی ئیسپانیا لە کۆمەڵگای کشتوکاڵی فیلیپیندا زۆر بەهێز و چارەنووسساز بووە. فیلیپین تەنیا وڵاتێکی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیایە کە زۆرینەی خەڵکەکەی مەسیحیین. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا زیاتر لە دوو سەد ساڵ لە حکوومەتی ئیسپانیا لە فیلیپین تێدەپەڕێ و گرووپێکی زۆر لە خەڵکی ئەم وڵاتە کە لەژێر نفووز و پەروەردەی فەرهەنگی مەزهەبی ئیسپانیادا بوون بۆ گرتنە دەستی

(1) Batavia (Jakarta).



پۆستە دەوڵەتی و مەزهەبییەکان مەرجی پێویستیان بووە، بەڵام سەرەڕای ئەمانە، ئیسپانییەکان ئامادەنەبوون، کە ئەوان لە نێوا خۆیاندا قبووڵ بکەن. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا تووڕەیی خەڵکی فیلیپین بووە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی ئیسپانیا سەرەڕای کاریگەریی فەرهەنگی و مەزهەبی لە فیلیپین، دامەزرێنەری کۆڵەکە ئابوورییەکانی دەرەبەگایەتی بووە، کە پاش تێپەڕبوونی چەندین سەدە بووەتە هۆی ریزبەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی. هێشتاش لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ئەم بارودۆخە بەشێوازی نوێتر لە فیلیپیندا دەبینرێ و هەندێك لە بنەماڵە گەورەکان هەروا دەسەڵاتی پێشوویان ماوە. بۆ وێنە خانەدانی ئووسمان[1] هێشتا کۆنترۆڵی هەرێمی سێبۆ[2] یان لەدەست دایە و بەکردەوە ئەم هەرێمە لەلایەن ئەوانەوە ئیدارە دەکرێ. ئەو لێکۆڵینەوانەی سەبارەت بە فیلیپین بەڕێوەچوون نیشانی داوە، کە بارودۆخی ئەم وڵاتە لەگەڵ وڵاتانی دیکەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و تەنانەت ڤییتنامدا جیاوازی هەیە.

لە تەواوی ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا پێش هاتنی داگیرکەرانی ڕۆژئاوایی لە سەدەی هەژدەهەمدا، ژیانی لادێیی مۆدیلێکی سەرەکی بوو و ژن و پیاو لە ڕێگای کشتوکاڵ و وەرزێڕییەوە بژێوی خۆیان دابین دەکرد. بێجگە لە ڤییتنام لە هیچ شوێنێکی دیکەی ناوچە، مڵکداریی زەوی بە چەمکی ڕۆژئاوایی لە ئارادانەبوو. بنەماڵەیەك بۆ چەندین ساڵ خەریکی کشتوکاڵ بوون لەسەر زەوییەکی دیارکراو، بەڵام زەویەکە هی ئەوان نەبوو و ئەوە فەرمانڕەوا بوو، کە خاوەنی موڵك بە حەسیب دەهات. هەتا کاتێك کە حەشیمەت کەم بوو کێشەیەك لە ئارادا نەبوو، بەڵام هەر کە بەهۆی وشکەساڵی، شەڕ، قاتوقڕی، و هتد... دەرەکانی کشتوکاڵ لەم ناوچەیە لەنێوچوو و هەندێك لە بنەماڵەکان یان تەواوی ئاواییەك بۆ ناوچەیەکی دیکە کە زەوی کشتوکاڵی هەبوو رادەگوێزران کێشەیەکی زۆر دروستدەبوو. ئەم بارودۆخە هەتا سەدەی نۆزدەهەمدا بەرپرسانی فەڕەنسی لە کامبۆدیا سەرسام مان لەوەی کە خەڵکی لادێکانی کامبۆدیا و تایلەند بەردەوام لە ماڵی هاتوچوو و نیشتەجێ بوونی کاتیی لەنێوان دوو وڵاتدا بوون، چونکە بەبۆچوونی ئەوان ئەم کارە بە کردەوە، ناسنامەی نەتەوەیی ئەوانی خەوشدار دەکرد.

(1) Osmana.
(2) Cebu.

پاش سەدەی هەژدەهەم، سەرجەمی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا تووشی گۆڕانکاری بنەڕەتی هات و ناوچەکەی گۆڕی. زۆربەی ئەم گۆڕانکارییانە بەهۆی کاریگەری ڕۆژئاوا لە ناوچەدا بوو. بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم تەنیا تایلەند نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانەوە، دیارە مەبەست دەسەڵاتی ڕاستەوخۆیە، چونکە وڵاتی تایلەندیش وەکو ناوچەکانی دیکە بۆ هێرشی بەربڵاوی داگیرکەرانی ڕۆژئاوایی بۆ ناوچە گۆڕانی بەسەردا هات و لە گۆڕانکارییەکانی ناوچە بێ بەش نەبوو. ئاڵوگۆڕێکی دیکە لە ناوچەدا ڕوویدا، کە پێوەندی بە پێشڕەوی هێزە ڕۆژئاواییەکانەوە نەبوو. لە سێ دەیەی دوایی سەدەی هەژدەهەمدا لە ڤییتنام وەرچەرخانێك دروستبوو و مۆدێلە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی، وڵاتی خستە بەردەم هەڕەشەیەکی جیدییەوە. سەبارەت بەوەی ڕۆڵی شۆڕشگێڕانی تای سۆن لەم وەرچەرخانەدا چەندە بووە جێگای باس و موناقەشەیە[1].

بەشداری ئیمپراتۆری نوێ واتە زنجیرەی چاکری کە لە ساڵی ١٧٨٢ تا ئێستا لە تایلەند حکوومەتیان بەدەستەوەیە، بووەتە هۆی ئەوەی کە کەسانی لێوەشاوە لە سەرووی دەسەڵاتەوە دابنرێن و بەدەسەڵات و کەسایەتی تایبەتی خۆیانەوە ئەم وڵاتە بگۆڕن. ڕێبەرانی زنجیرەی چاکری بەهۆی ژیری و وشیاری خۆیان لایەنگری کران لە ڕۆژئاوا، گەیشتنە شکۆ و گەورەییەکی بێ وێنە لە تایلەندا. ئەوان بە پێچەوانەی پاشاکان و ڕێبەرانی پێش خۆیان لە ناوچە، کە دەرگای کۆشکی پاشایەتی خۆیان بەڕووی ڕۆژئاواییەکاندا بەستبوو و بەبیانووی پاراستنی داب و نەریتە لە مێژینەکانیان ئامادەنەبوون پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوا قبووڵ بکەن، کەڵکیان لەکارناسانی ڕۆژئاوایی لە کۆشکی پاشاکان وەرگرت و خۆیان لەگەڵ ئاڵوگۆڕە جیهانییەکاندا ڕێکخست.

ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بەهۆی هێرشی ڕۆژئاوا پێکهاتن یان ئاڵوگۆڕی پێکهاتوو لەلایەن ڕێبەرانی ناوچەوە، نەتەنیا بووە هۆی گۆڕانکاریی حکوومەتە ناوچەییەکان، بەڵکو کاریگەری زۆری لەسەر خەڵکی ئەم وڵاتەدان و ئاڵوگۆڕی دوایی بەدوای خۆیدا هێنا، بەشێوەیەك کە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەتوانرێ وەك خاڵی وەرچەرخانی گەورە لە مێژووی ناوچەدا دابنرێ.

(١) بۆ زانیاری زیاتر: جاسبی، عبداللە، انقلاب ویتنام، نشر نوە تهران: ١٣٦٢.

# فەسڵی چوارەم

کةمايةتييةكان و بيَطانةكان لة باشووری رؤذهةلآتی ئاسيا ثيَش هيَرشی رؤذئاوا

لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا سەرەڕای خودی خەڵکە خۆجێیەکە، کەسانێکی دیکە هەبوون کە لە وڵاتانی جۆراوجۆری ئەم ناوچەیەدا دەژیان. ئەم کەسانە بەجێماوەی کەسانێك بوون کە لە شوێنە زۆر دوورەکانەوە بۆ ئەم ناوچەیە کۆچیان کردووە و لەوێ نیشتەجێ بوون. هیندییەکان، ئێرانییەکان، چینییەکان و عەرەبەکان لەو خەڵکانە بوون کە هاتنە ئەم ناوچەیە. ئەم گرووپانە تا سەدەی نۆزدەهەم گرینگییەکی ئەوتۆیان نەبوو، لەڕاستیدا بێگانە ڕاستەقینەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ئەوانە بوون، کە لە کوێستان و دۆڵەکاندا دەژیان و پێوەندییان بە حکوومەتی ناوەندییەوە نەبوو.

فەرمان و ڕێوشوێنەکانی دەوڵەت ئەوانی نەدەگرتەوە و ئەوان کارێکیان بەیاسا و بونیادە دەوڵەتییەکانەوە نەبوو و خۆیان بە فەرمانبەری حکوومەت نەدەزانی. هەرچەند ئاکاری ئەم خەڵکە لە دەرەوەی چوارچێوەی حکوومەتی ناوەندیدا بوو و بۆخۆیان یاسا و ڕێوشوێنی تایبەتییان بووە، ڕۆڵێکی گرینگیان لە ناوچەدا گێڕاوە. ئەوان خاوەنی کۆیلە و بەرهەمەکانی دارستان و هەروەها خاوەنی توانایی تایبەت وەك بارهێنانی فیل بوون و لەم ڕێگایەوە لەگەڵ ناوچەکانی ناوەند پێوەندی و ئاڵوێریان دەکرد.

زۆرجار پێوەندی خەڵکی ناوچە دوورەدەستەکان یان بە واتایەکی دیکە خەڵکی بێگانە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی ناوەند زۆر نزیکبووە. بۆ نموونە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی تایی زمان نیشتەجێ لە کوێستانەکان، لەگەڵ خەڵکی تایی زمانیی ناوچەکانی ناوەند خۆیان بە یەك



دەزانن و وەك ئەوان بەتایی ناودەبەن. لە حاڵێکدا ئەم دیاردەیە لە گرووپەکانی دیکەدا بەرچاو ناکەوێ و یەکگرتوویی زمانی نەبووەتە هۆی پێوەندی نێوانیان، لەوانە خەڵکی سێدانگ[1] و باهنار[2] کە لە کوێستانەکانی نێوان کامبۆدیا و ڤییتنام دەژین، بە زاراوەی خەڵکی خێمێر قسە دەکەن، بەڵام ئەم یەکگرتنە زمانییە نەبووەتە هۆی یەکبوون یان لانیکەم پێوەندی نزیکتری ئەوان لەگەڵ ناوچەکانی ناوەند یان خێمێرنشینەکان. دابەشبوونی کۆمەلایەتی ناوچەکانی ناوەند و ناوچە دوورەدەستەکان بە تەواوی جیاوازە. ڤییتنامییەکان بە خەڵکی ناوچە کوێستانییەکانیان دەگوت موی[3] و خەڵکی کامبۆدیا ئەوانیان بە پنونگ[4] ناودەبرد و لاوسییەکان پێیان دەگوتن خا[5] کە هەموو ئەم وشانە بە مانای دڕندە و بەربەر بەکاردێ. وشەی بەڕبەڕ هاوتای چەمکی ((ڕودیاردکپلین))[6]ە واتە ڕەگەزی خواروو و بێ یاسا. خەڵکی ناوچە دوورەدەستەکان یان بەواتایەکی دیکە بێگانەکان خزمەتی زۆریان بە خەڵك و حکوومەتی ناوەندی دەکرد، بۆ وێنە ئامادەکردنی سەرباز بۆ سوپا یان کۆیلە و خزمەتکار بۆ سەرزەوییەکان. ئەو پێوەندییانە هەرچەند ڕێکوپێك نەبوون، بەڵام کاریگەریی تایبەتی هەبووە لەسەر کۆمەڵ و وڵات. بۆ وێنە خەڵکی ناوچەکانی باکوور وەك کەسانی ئازا و لێهاتوو باسیان لێوە دەکرا، هەر بۆیە لەکاتی شەڕەکاندا کەڵکیان لێ وەردەگرتن و لە ئەدەبیاتی وڵاتی کامبۆدیا هەستی خۆڕاگرییان جێگای سەرنجە. هەندێك ئەرکی دیکەش هەبوون کە لە ئەستۆی هەندێك گرووپی تایبەتدا بوون. کەمایەتییەکانی دیکە، کە زۆربەیان لە کوێستانەکاندا دەژین، خاوەنی جۆرێك دەسەڵاتی تایبەتین کە زۆرتر پێوەندی بە سێحر و جادووەوە هەیە. لە سەدەی هەژدەهەمدا پاراستنی داب و نەریتە کۆنەکان لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بە تەواوی دەبینرا، ڕێبەرانی ڤییتنامی و کامبۆدیای بۆ دوو سیحرباز کە پێیان وابوو لە کێوەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا دەژین ڕێزێکی تایبەتییان هەبوو. ئەم دوو سیحربازە، کە لە ئەفسانەکانی کامبۆدیادا پێیان دەگوتن پاشای ئاگر و ئاو، بۆ پاشا و خەڵکی کامبۆدیا زۆر گرینگ بوون و

(1) The Sedongs.
(2) The Behnars.
(3) Moi.
(4) Phnong.
(5) Kha.
(6) Rudyaed Kipling's Concept.

دیارییان بۆ دەناردن کە لە نرخ و بەهادا هاوتای ئەو دیارییانە بوون، کە پاشا بۆ ڕێبەرانی ڤییتنام و تایلەند دەنارد (پاشاکانی کامبۆدیا بە ناردنی دیاری بە کردەوە خۆیان لە مەترسی ڤییتنام و تایلەند، بەهێزترین هێزی ئەوکاتی ناوچەبوون دەپاراست). لە بیروباوەڕی خەڵکدا. ئەم کردەوەیە بەهۆی بەهێزی سیحراوی ئەم سیحربازانە و پێوەندییان لەگەڵ ئەفسانەکانی کۆنی خەڵکی کامبۆدیا، وەکو پەریرەخان[1] بووە.

تائێستا زیاتر باسی ئەو دەستە لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیامان کردووە، کە لەڕووی ڕەگەز و دەسەڵاتەوە بە تەواوی بەرچاو بوون. وەکو ڤییتنامییەکان، کامبۆدیاییەکان، تاییەکان، لاوییەکان لە لاوس[2]. بەڵام ڕەوشەکە لە ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا بە تەواوی جیاواز بوو، بۆ وێنە بێرمە ڕەوشێکی تایبەتی هەیە. ئەم وڵاتە سەرەڕای مێژووی دوورودرێژی، بەدەگمەن حکوومەتێکی یەکگرتووی بووە. بێرمە زۆرتر کۆنتڕۆڵی بەسەر شیو و دۆڵ و ناوچە نزمەکاندا هەیە و ناوچە کوێستانییەکان کە لە سنوورەکانی بێرمەدان بە دەگمەن دەستی دەسەڵاتی ئەو وڵاتەی پێ گەیشتووە و حکوومەتی بێرمە لەو ناوچانەدا دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبووە و نییەتی. کەمایەتییەکان لەبێرمە زۆرن و هیچ یەك لەوانە دەسەڵاتداریێتی بێرمەیان قبووڵ نییە، شانەکان، کاچینەکان، کارنەکان و چینییەکان کە چوار ڕەگەزو گرووپی جیاوازن لە بێرمەدا، زیاتر لە یەك سێهەمی حەشیمەتی ئەو وڵاتە پێك دێنن. شانەکان و کارنەکان تەنها خۆیان زیاتر لە ١٦ لە سەدی حەشیمەتی ئەو وڵاتە پێکدێنن لە حاڵێکدا، لە وڵاتانی تایلەند، ڤییتنام و کامبۆدیا تەواوی کەمایەتییەکانیان ٢٠ لە سەدی حەشیمەت پێك نایەنن، ئەمە یەکگرتوویی نەتەوەیی ئەم وڵاتانە نیشاندەدا. بەڵام سەبارەت بە بێرمە بارودۆخەکە بەم جۆرە نییە، لەم وڵاتەدا شانەکان و کارنەکان و کەمایەتییە ئەتنیکەکانی دیکە هەرچەند وەك بێگانە چاویان لێدەکرێ، هیچکات نەچوونە ژێر دەسەڵاتی بێرمەوە. شتێکی دیکە ئەوەیە، کە بێگانەکان لە تایلەند و ئەو وڵاتانەی ئاماژەمان پێکرد. هیچ کاتێك نەبوونەتە هەڕەشەیەك بۆ حکوومەت، بەڵام ئەم مەسەلەیە لە بێرمەدا حاڵەتێکی دیکەی

---

(١) پەریرەخان: شمشێرێکی بەناوبانگی ئێندرا، خوای بەناوبانگی هیند بوو کە هەورە برووسکەی ئیندراشیان پێدەگووت.

(2) Kunstadter, P.ed., Southeast. Asian Tribes, Minorities and Nations, 2 vols., Princeton, N. J., 1987.



هەیە. لەم وڵاتەدا کەمایەتییەکان سەرقاڵی مەسەلە حکوومەتییەکانن و بەکردەوە لەدژی یانگون، ناوەندی دەسەڵاتدا خەبات دەکەن. بەدرێژایی مێژوو و هەتا ئەم ساڵانەی دوایش لە تایلەند هیچ پێوەندییەك لەنێوان خەڵکی ناوچە کوێستانییەکان و خەڵکی دەشتەکاندا نەبوو.

بارودۆخی وڵاتانی وشکانی ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا لەگەڵ بارودۆخی وڵاتانی ئاوی خاکیدا جیاوازە. سەرەڕای ئەوە کە دانیشتووانی ناوچەکانی ئاوی خاکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (مالایا، ئەندونزیا و فیلیپین) بە زمانگەلێك قسە دەکەن کە ڕەگێکی هاوبەشیان هەیە، بەڵام هەڵکەوت و تایبەتمەندی جوگرافیایی ئەوان بە جۆرێکە کە بووەتە هۆی جیایی و لێك بڵاوبوونیان. لە دوورگەی گەورەی جاوە- کە هەر ئێستا بەسەد ملیۆن حەشیمەت گرینگترین دوورگەی وڵاتی ئەندونزیایە- چەندین سیستەم وەك حکوومەتی هیندۆی ماجاپاهیتا (سەدەی چوارەم و پازدەهەم) یان حکوومەتی شری وجایا، گەورەترین حکوومەتی ئاویخاکی ناوچە (سەدەی یازدەهەم-سێزدەهەم)، نەیانتوانی حکوومەتی خۆیان لە ناوچەکانی دراوسێدا پەرە پێبدەن. هۆی سەرەکی ئەم کارە نەبوونی یەکەمین زمانی و ڕەگەزی لە دەرەوەی ناوچەکانی ناوەندا بوو. لە ناوچەکانی ئاوی خاکی بەجێگای بوونی زۆرینەیەکی بەرچاو و یەك یان چەند کەمایەتی بەرتەسك زۆربەی حەشیمەکەی لەو کەمایەتیانە پێکدەهات کە بەشێوەیەکی تایبەتی پێوەندییان پێکەوە هەیە. بەگشتی لە ناوچە جوگرافیاییە پەرشوبڵاوەکان یان دوورگە پەرشوبڵاوەکاندا نەدەکرا، حکوومەتێکی یەکگرتوو پێکبێ کە هەموو ئەو ناوچانە بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

لە هەندێك لە ناوچەکاندا، چەند کەمایەتییەك دەژیان کە هاوشێوەی بێگانەکانی تایلەند و کامبۆدیا بوون. ئەم کەسانە کە لە سەرتاسەری نیمچە دوورگەی مالایا، دوورگەی ئەندونزیا و دوورگەی فیلیپین بڵاوبوونەتەوە، پاشماوەی ئەو کەسانەن کە یەکەمین کۆمەڵگاکانیان لەم ناوچانەدا دامەزراندووە.

جیاوازی سەرەکی شێوەی ژیانی کوێستاننشین و سارانشینەکانی ئەم ناوچەیە ئەوەبوو، کە گرووپی دووەم کارێکی بەردەوام وەك وەرزێری، ڕاوەماسی یان بازرگانیان دەکرد و گرووپی یەکەم دەوارنشین و ڕاوچی بوون. لە وڵاتانی مالایان (مالیزیا، سەنگاپوور و برۆنی ئێستا) کۆمەڵە

دوورگەی ئەندونزیا و دوورگەی فیلیپیندا هیچ کاتێك خۆیـان لـە حکوومـەتی ناوەنـدی بـە جیـا نەزانیوە و لەگەڵیدا لە پێوەندی نزیکدا بوون.

سـەرەڕای ئـەو گرووپانـەی ئاماژەمـان پێکـرد، لـەم ناوچـەیەدا کەسـانێك هـەبوون کـە ئەوروپاییەکان پێیان دەگوتن کۆیلە. ئەم کەسان بەشێك بوون لە مـوڵکی ئـەرباب و لـە مـافی ئینسانی بێبەش بوون. ئەو کەسانەی کە بە کویلەتی دەگیران، لەریزی ئەم کەسانەدا بوون.

بێجگە لەم کەسانە کە بەڕاستی کۆیلەبوون، گرووپێکی دیکەش هەبوون کە پێیـان دەگـوتن کۆیلەی کاتی. ئەوانە ئەو قەرزدارانەبوون کە بـەهۆی دەسـتکورتی نـەیانتوانیبوو قـەرزەکانیان بدەنەوە و بەشێوەی کاتی بوونەتە کۆیلەی کەسی خـاوەن قـەرز. دیـارە لـە کـردەوەدا ئـەم دوو گرووپە هیچ جیاوازییەکیان پێکەوە نەبوو و گرووپی دووەم لەنێو کۆمەڵگادا بـە بێگانـە سـەیر نەدەکران، سەرئەنجام کەسانێك لە ناوچەدا هەبوون کە پلەیەکی نێونجیان بووە، ئـەوان بەشـێوەی بنەماڵەیی لە مێژبوو لـە خزمـەتی پاشـا یـان دەسـەڵاتداراندا بـوون و هـیچ هیوایـەکیان بـۆ رزگاربوون لەم پێشەیە نەبوو و لە بنەڕەتدا پێش لەدایکبوون چارەنووسیان دیاربووە.

لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا، پیشەسازی بە واتای نوێ بە کردەوە لە ناوچەدا نـەبووە. هەروەها لەنێوان چینی دەسەڵاتدار و کەسـانێك کـە خزمـەتیان پێکـردوون و چـینی خـوارووی کۆمەڵ، سنوورێکی نێونجی نەبووە، بە واتایەکی دیکە خەڵك بەسەر دوو دەسـتەی دارا و نـەدار دابەشکرابوون. ڤییتنـام بەرواڵـەت بـەهۆی لایـەنگریکردن لـە قوتابخانـەی کۆنفوسـیوس ئـەم دابەشکردنە نەیدەگرتەوە، بەڵام هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکـرا، ڤییتنـامیش کۆمەڵگایـەکی داخراو و چینایەتی بوو.

باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا پێش سەدەی هەژدەهەم، کۆمەڵگایەك بوو کە تاڕادەیەك لەسەر بنەمای رەفتارێکی دروست سیستماتی دامەزرا بوو، کـە لـەودا داب و نـەریت و رێ و رەسمـە کۆنەکان جێی سەرنج و بایەخی خەڵك بوون لە هـەمان کاتـدا ناوچـەیەکی لاواز بـوو، چـونکە بێگانەکان کە هێرشیان هێنابوو، گۆڕانکارییان لە ناوچەکەدا پێکهێنابوو سیستەمی پێـشوویان گۆڕیبوو. بەم شێوەیە ململانێیەك لە نێوان سوونەت و نوێخوازیدا دەستیپێکرد کە ئاسـەواری گەورەی لێکەوتەوە.

# فەسڵی پێنجەم

## هێرشی رۆژئاوا بۆ ناوچەکە و دەرەنجامەکانی

گرینگی رۆژئاوا لە مێژووی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا بۆ هیچ کەس لە کارناسانی ناوچەکە شاراوە نییە. سەرەڕای ئەمە، ناکۆکی نێوان بیروبۆچوونەکان رادەی ئەو گرینگبوونە دەردەخات. هەندێك پێیان وایە ئەم هێرشە بووەتە هۆی خێروبەرەکەتی ناوچەکە و هەندێکی دیکە وەك نووسەری ئەم دێڕانە پێمان وایە ئەم گرنگییە رێژەییە و پێ لەسەر ئەوە دادەگرین کە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا (بێجگە لە فیلیپین) خاوەنی شارستانیەتێکی دەوڵەمەند بوون (ئانگور، پاگان، شری وجایا، جاوە، مالاکا و هتد...) و لەوحێکی سپی نەبووە کە ئەوروپاییەکان باشترین و جوانترین وێنەیان لەسەر کێشابێ. مێژووی سیاسی ناوچە کە زۆرتر لەلایەن رۆژ ئاواییەکانەوە نووسراوە، وێنەیەکی ناڕاستی لە کۆمەڵگا پێشکەوتوو و دەوڵەمەندەکان نیشان داوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ خۆ بە زلزانین و کەم بایەخ کردنی فەرهەنگە نەناسراوەکان. زۆربەی خەڵکی خۆجێی لەم پێوەندییەدا شتیان نووسیووە، زۆرتر لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی رۆژئاواییدا بووە و بەهۆی کاریگەریی رۆژئاوا لێکۆڵینەوەیەکی دروستیان پێشکەش نەکردووە. لەم دواییانەدا کارناسانی ناوچە، خەڵکی خۆجێی و غەیرە خۆجێی، لەم بارەیەوە هەندێك شتی تازەیان بۆ دەرکەوتووە و چەند مەسەلەیەکیان روون کردۆتەوە کە رۆژ بەرۆژ گەورەیی مێژووی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا زیاتر نیشاندەدا.

پێش جەنگی یەکەمی جیهانی واتە پێش سەرهەڵدانی نوێ بەرامبەر بە مەسەلەکانی ناوچە، بەشی زۆری ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بەمێژووی سیاسی ناوچەکە دەنووسران، حکوومەتی کۆلۆنیالیزمی هۆڵەندیان بە رێژمێکی تەواو و سەقامگیر ناودەبرد و ئاماژەیان



بە رابردووی چەند سەدساڵەی ئەو وڵاتە دەکرد. لەم کتێبانەدا هاتووە کە هۆڵەندییەکان لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا هاتوونەتە ناوچەکە و بۆ ماوەی سێ سەد ساڵ حکوومەتێکی بە توانایان لە دوورگەی ئەندونزیادا پێکهێناوە. بە سەرنجدان بەم باسە، ئەوەی بە مێشکدا دێ ئەوەی کە هۆڵەندا لە ئەندونزیادا حکوومەتێکی بەربڵاو بەهێزی هەبووە، لە حاڵێکدا وانییە. چونکە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم چەندین بەشی سەرەکی دوورگەی ئەندونزیا لەژێر دەسەڵاتی هۆڵەندا هاتبووە دەرێ و خەڵکی ئەم دوورگەیە لە دژی حکوومەتی داگیرکەر و سەرەڕۆی هۆڵەندا بەرگری لەخۆیان کرد بوو، هەربۆیە تا سەدەی نۆزدەهەم، هۆڵەندا هیچ حکوومەتێکی یەکگرتووی لە ئەندونزیادا نەبووە. دیارە بەشداری هۆڵەندا لە ئەندونزیا حاشا هەڵنەگرە. هەروەك بوونی ئیسپانیا و ئەمەریکا لە فیلیپین، بوونی فەڕەنسا لە وڵاتانی هیند و چین (لاوس، ڤییتنام و کامبۆدیا) و بوونی بەریتانیا لە بێرمە و مالایا.

پێکهێنانی سنوورە نێونەتەوەییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا یەکێك لە دەستکەوتەکانی کۆلۆنیالیزمی رۆژئاوا بوو. لەلایەکی دیکەوە، رۆڵی رۆژئاوا لە ناوچە زۆر لەوە کەمترە کە لە نووسراوەکانی پێش جەنگی دووەمی جیهانیدا دراوەتە پاڵیان. بۆ وێنە بەپێی ئەم نووسراوانە، بەرپرسانی فەڕەنسی لە ڤییتنام بە وردی چاوەدێرییان بەسەر سەپاندنی کەلتووری فەڕەنسەیی بەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیەدا دەکرد، کەچی ئاکامەکان بە پێچەوانەی ویستی ئەوان کەوتنەوە، چونکە زمان و فەرهەنگ و داب و نەریتی بێگانەکان هیچ کات نەیتوانی داب و نەریت و فەرهەنگی ڤییتنام بخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە و بەسەردا زاڵبێ[1].

ئەوروپاییەکان تەنیا ئامانجیان بەرەوپێش بردنی بەرنامەکانی خۆیان بووە و هیچ زانیارییەکیان لەسەر ئەوکۆمەڵگایانە نەبوو، کە حکوومەتیان بەسەردا دەکرد و فەرهەنگ و داب و نەریتی خەڵکی سەرزەویە داگیرکراوەکانیان نەدەناسی. هێنانەوەی نموونەیەك مەسەلەکە روونتر دەکاتەوە. لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم دوو سەد ساڵ بوو کە هۆڵەندا حکوومەتی بەسەر جاکارتادا دەکرد، زۆربەی ناوچەکانی دوورگەی جاوە بەسترابوونەوە بە کۆمپانیای هۆڵەندی هیندی رۆژهەڵات. بەپێی رێککەوتننامە بازرگانییەکان، بەرپرسانی ئەم کۆمپانیایە لە بەرامبەر هۆڵەندادا بەرپرسیاربوون، بەڵام بەشداری بەرپرسیانی ئەم کۆمپانیایە لە دوورگەی

---

(1) Roberts, S. H., The History of French colonial Policy, 1870-1925, reprinted edition, 1966, p.162.

جاوەدا بە مانای دەسەڵاتی سیاسی فەرهەنگی هۆڵەندا نەبوو، چونکە فەرهەنگی خەڵکی جاوە هەروا بەهێز و شکۆ خۆی پاراست[١]. هۆڵەندییەکان زانیارییەکی ئەوتۆیان لەسەر ئەو ناوچەیە نەبوو کە بەناو حکوومەتیان بەسەردا دەکرد. هۆڵەندا پاش دووسەد ساڵ دەسەڵاتدارێتی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بۆی دەرکەوت کە لە نزیك شاری یوگ یاکارتا[٢]، لە ناوەندی جاوە، بینایەکی مێژوویی گەورە هەیە کە یەکێك لە بیناسەرسوورهێنەرەکانی جیهانە. سەیر ئەوەیە کە دۆزینەوەی ئەم بینایە، واتە پەرستگەی بوودایی بوروبودور[٣]، لەلایەن هۆڵەندییەکانەوە نەبوو، بەڵکو بەریتانییەکان ئەو شوێنەیان دۆزییەوە[٤].

کەواتە ئەم پرسیارە دێتە پێشێ کە ئەوروپاییەکان بە سەپاندنی هێزی ئابووری و سیاسی خۆیان چ گۆڕانکارییەکیان پێکهێنا.

یەکەم ئەوەیە کە ئەوا بە پێکهێنانی سنوورە نەتەوەییەکان بوونە دەسەڵاتی باڵا دەست لەناوچەدا، وڵاتە ئەوروپاییەکان بەکردەوە پێکهێنەری سنوورە کۆلۆنیالییەکانی ناوچە بوون، کە هەر ئەو سنوورانەی ئێستا وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیان. کاریگەریی دیکەی ئەوروپاییەکان بڕۆنە ژێر پرسیاری بایەخەکانی رابردوو و شێوازی ئیدارەی حکوومەتەکانی پێشووی ناوچە بووە.

زاڵبوونی رۆژئاواییەکان بووە هۆی ئەوەی کە کەم وکوڕییەکانی حکوومەتەکانی و بایەخەکانی پێشووی ناوچەکە زۆرتر زەق ببنەوە، چونکە بێتوانایی ئەوانی لەبەرامبەر هێرشی رۆژئاوادا ئاشکرا دەکرد و کۆمەڵگای تووشی قەیرانێکی بایەخەکان کرد. بەهەرحاڵ پێویستە کاریگەریی هێرشی رۆژئاوا لە هەر یەك لە وڵاتانی ناوچە بەشێوەی جیا تاوتوێ بکەین.

(١) هەندێك لە بایەخە سوونەتییەکانی جاوە لە قۆناغی داگیرکاریی هۆڵەندا بووژانەوە وەکو (Nusantara) یارمەتی گەورەی ئەندونزیا.

(2) Yogyankarta.
(3) Borobodor.
(4) Day, C, The Policy an Administration of the Dutch in Java, Kuala Lampur, 1966. PP. 68-69.



## أ) وڵاتە وشکارۆییەکان:

### ١- بێرمە:

وڵاتی بێرمە هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەهەمی زاینی نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی وڵاتە داگیرکەرەکان. ئەم وڵاتە کە لە کۆنەوە بە هۆی بوونی چەند رەگەزێکی جیاواز بەردەوام بارودۆخێکی ناسەقامگیری بووە لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٨) دا لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی زنجیرەی پاشاکانی کۆن بانگ[١] گیانێکی نوێی هاتەوەبەر. لە قۆناغی پاشایەتی ئالونگایا[٢]، دامەزرێنەری زنجیرەی باسکراو (١٧٥٢-١٧٦٠) و جێگرەکانی ناوبراو بەتایبەت بودا پایا[٣] (١٧٨٢-١٨١٩) یەکیەتی نیشتمانی بەهێز لە بێرمەدا دروستبوو و تارادەیەك مەترسی هێرشی دراوسێکانی کەمکردەوە. بەم شێوەیە، کێشە نێوخۆییەکانی بێرمە تارادەیەك چارەسەر کران، بەڵام کێشەی گەورەی ئەم وڵاتە ئەوەبوو کە بەهاتنی بەریتانیای دایگرکەر بۆ سەر سنوورەکانی ئەم وڵاتە، نەیدەتوانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بپارێزی. دیارە مەبەست لە پاراستنی ئەو ناوچانە ئەوە نەبوو، کە بێرمە بە تەواوەتی بەسەریاندا زاڵ بوو، یان بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی گرتبووە دەست، بەڵکو مەبەست پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانە بوو کە لەو ناوچانەوە بەدەستی دەهێنان[٤]. لەکاتی نەبوونی رکەبەر لەم ناوچەیەدا، دەوڵەتی بێرمە بە کردەوە دەستی لە کاروبارەکانیاندا وەرنەدەدا. بەریتانیا لە ناوچەکانی ئاسام، مانی پوور و ئاراکاندا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی کۆمپانیای بەریتانیای هیندی رۆژهەڵات چەندین رێوشوێنی دیاری کرد، کە بەم پێیە دەوڵەتی بێرمە وەك بەرپرسی زیان گەیاندن بە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا دەناسرا. دەبوا پاشای بێرمە کارێك نەکا کە زیان بە (کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات)ی بەریتانیا بگەیەنێ. ئەم کارە و هەندێك مەسەلەی دیکە وەك مۆڵەتی بازرگانە بەریتانییەکان بۆ بازرگانی ئازاد لە بێرمە بووە هۆیی دووبەرەکی لە نێوان بەریتانیا و بێرمەدا. پێوەندی نێوان دوو وڵات رۆژ بەدوای رۆژ بەرەو ساردی دەڕۆیشت، تا سەرئەنجام بەگی دائۆ[٥]، پاشای بێرمە (١٨١٩-١٨٣٧) بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ زێدەخوازییەکانی بەریتانیا پەلاماری بەنگاڵی دا.

(1) Konbaung.
(2) Alaungpaya.
(3) Bodawpaya.
(4) Maung Htin Aung, A History of Burma, New York. 1968, pp.38-39.
(5) King Bagyidaw.

هێرشی بێرمە بۆ سەر بەنگاڵ بیانوویەکی دایە دەستی هێزە بەریتانییەکان هەتا پەلاماری وڵاتی بێرمە بدەن. لەگەڵ پەلاماری بەریتانیا شاری رانگون[1] هەرەسی هێنا. ئەم شکستە گەورەیە، ئیمزای ڕێککەوتننامەی یان دابۆ[2] لە ساڵی ١٨٢٦ی لێکەوتووە و بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات دەسەڵاتی ناوچەی ئارگان و ((تناسریم))[3]ی بەدەستەوە گرت. بەریتانیا زیاتر لە بیست ساڵ کەڵکی لەم ئیمتیازە وەرگرت، ئەگەرچی دەیتوانی پێشڕەوییەکی زیاتر بکا، بەڵام هەر لەو ناوچەیەدا مایەوە. سەیر ئەوەیە کە بەریتانیا زیاتر لە سەد ساڵ لە ناوچەکانی لێواری مالایاش جێگیر بووە، بەڵام بۆ نێوخۆ پێشڕەوی نەکردووە، ئەمە نیشاندەدا کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا هێشتا مەسەلەی ئابووری لە پێشەوەی مەسەلەی سیاسی و پەرەپێدانی دەسەڵاتی کۆلۆنیالی بووە و لەکاتی سەقامگیر نەبوونی سیاسیدا، داگیرکەران پێویستییەکیان بۆ زێدەخوازی هەست پێنەدەکرد[4]. دەوڵەتی بێرمە لە سەرەتادا، بێ گوێدان بە بەریتانیاییەکان زۆرتر خەریکی مەسەلە نێوخۆییەکانی خۆی بوو، بەڵام پاش یەك یان دوو دەیە، بوونی ئەوانیان قبووڵ نەکرد و ڕێگای بەربەرەکانێی گرتە پێش. دەکرێ دژی کردەوەی ئەو سەردەمەی ڕێبەرانی بێرمە لەگەڵ دژکردەوەی چین لە قۆناغی ئیمپراتۆری مەنجو-چینگ[5] لە شەڕی یەکەمی تریاك (١٨٣٩-١٨٤٢) بەراورد بکرێ[6].

بێرمەییەکان بەبێ لێکدانەوەی ورد لە سەرەتای دەیەی پەنجای سەدەی نۆزدەهەم، دەستیان دایە بەربەرەکانێ لەگەڵ بەریتانیا و بەریتانیاش کە داگیرکردنی بێرمەی وەك تاقیکردنەوەی هێز و توانای خۆی و زەمینە خۆشکەرێك بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەزانێ، دووەمین جەنگی بەسەر بێرمەدا سەپاند. لەم شەڕەدا کە سەرەتا بەبێ ئیزنی لەندەن دەستپێکرد زۆربەی بەشەکانی ناوچەی باشووری بێرمە، لەڕووی کشتوکاڵ و پیشەسازیی داردا گرینگییەکی زۆری هەبوو، لەلایەن بەیتانیاوە دەستی بەسەرداگیرا. بەریتانیا پاش دەست

(1) Rangoon.
(2) Randabo.
(3) Tenasserim.
(4) Cady, J. F., A History of Modern Burma, Ithaca, New York, 1979, p.12.
(5) Manchu-qing ernpire.
(٦) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە شەڕی تریاك: شاهندەبزاد، انقلاب چین، چاپ دووەم، ١٣٧٠.



بەسەرداگرتنی ئەو ناوچەیە چاوەڕێی دژکردەوەی بێرمە بوو، کە دیارە هیچ کات ئەو دژکردەوەیە رووی نەدا. لە دەیەی شەستی ئەم سەدەیە بەهۆیی کێبەڕکێی کۆلۆنیالیزمی فەڕەنسا، بێرمە بۆ بەریتانیا گرینگییەکی تایبەتی پەیداکرد، ڕێبەرانی بێرمە کە تەنیا بەدوای قازانجی تاکەکەسی خۆیاندا بوون و لە کۆشکە بەشکۆکانی ماندالیدا خەریکی بەڕێوەبردنی داب و نەریتە کۆنەکان بوون، لە مەسەلە سەرەکییەکان غافڵبوون، مەسەلەی ئەو بیانیانەی کە هاتوچۆی کۆشکی پاشایەتییان دەکرد و دەبوا لەبەردەم پاشادا پێڵاو لەپێ بکەن یان نا بۆ ئەوان لە داگیرکردنی ناوچە گرینگەکانی وڵات لەلایەن هێزی سەربازی بەریتانیاوە زۆر گرینگتربوو. ڕێبەرانی بێرمە دیلی بایەخەکانی خۆیان بوون و نەیاندەزانی کە پاراستنی ئەم بایەخ و داب و نەریتە کۆنانە لای بەریتانیا بێ مانایە. کارەساتی گەورەی بێرمە لە بنەڕەتدا ئەوەبوو کە ڕێبەرانی ئەو کاتی بێرمە نەیاندەتوانی راستییەکانی سەردەمی خۆیان ببینن.

## ٢- ڤییتنام:

ڤییتنام وەکو بێرمە لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتی داگیرکەردا نەبوو، بەپێچەوانەی بێرمە کە شەست ساڵ لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوو تەنیا بیست و پێنج ساڵ شاهیدی بوونی فەڕەنسا لە خاکی خۆیدا بوو. ڕێبەرانی ڤییتنامیش وەك ڕێبەرانی بێرمە خەبات دژی کۆلۆنیالیزمیان بە جیدری وەرنەگرت و خزابوونە نێو کۆشکەکانی خۆیان و ئاگایان لە دونیا نەبوو و خۆیان بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ داگیرکەران ئامادە نەکردبوو.

بۆ لێکۆڵینەوە لە هێرشی داگیرکەرانی ئەوروپایی بۆ بێرمە و ڤییتنام سەرنجدان بە سیستەمی ئەو دوو وڵاتە گرینگییەکی تایبەتی هەیە. هەلومەرجی ڤییتنام لە دەیەی ١٨٥٠. لەڕووی گەشەکردن و پەرەسەندنەوە لە مێژووی ئەو وڵاتەدا کەم وێنە بووە و سەرەڕای کێشەی نێوخۆیی، وەك جاران سەقامگیر و یەکگرتوو بوو. بەڵام مەسەلەیەکی هاوبەش لە هەردوو وڵاتدا ئەمە بوو کە ڕێبەرانی حکوومەتی بێرمە و ڤییتنام هیچ کامیان لە قووڵایی ئەو کارەساتە تێنەگەیشتبوون کە لە پێشیاندا بوو. کۆلۆنیالیزمی فەڕەنسا، ڤییتنامی وەك شارێکی بازرگانی لەگەڵ چیندا چاو لێدەکرد، لە حاڵێکدا ئەم دوو وڵاتە، واتە چین و ڤییتنام، سەرەڕای ئەوەی کە لەڕووی جۆری حکوومەت و ئەندێشەی کۆنفوسیۆسی و سنوورەوە هاوبەش و هاوشێوە بوون، بەڵام ئاڵوێرێکی ئەوتۆی بازرگانییان پێکەوە ئەنجامنەدەدا. هێزەکانی

فەڕەنسا بۆ پەلاماردانی ڤییتنام و دەستراگەیشتن بە ڕێگای بازرگانی لەگەڵ چیندا پشتیوانی کردن لە بانگەشەکەرانی مەسیحییان کردبووە بیانوویەك لە دەست خۆیاندا. ئەوان لەترسی پەرەسەندنی دەسەڵاتی بەریتانیا لەو ناوچەیەدا، هێرشێکی بەربلاویان بۆ سەر ڤییتنام دەستپێکرد. ڕێبەرانی ڤییتنام کە پێشبینی کردەوەیەکی ئەوتۆیان نەدەکرد. بەتەواوی غافڵگیر بوون. دەرباری کۆنفۆسیۆسی ڤییتنام و ڕێبەرانی ئەم وڵاتە ئامادەیی بەربەرەکانێیان لەگەڵ ئەم هێرشەدا نەبوو، لە حاڵێکدا لەم بوارەدا بێ ئەزموون نەبوون، چونکە چەند دەیە لەمەوپێش پەلاماری هێزە بێگانەکانیان بۆ سەر چین بینیبوو. ڕێبەرانی ڤییتنام هەر بەو ڕێگایەدا دەڕۆیشتن، کە ڕێبەرانی مەنچو لە چین گرتبوویانەبەر، ئەوان لە حاڵێکدا لە شاری قەدەغەکراوی خۆیان، پیکەندا، دانیشتبوون و هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ دنیای دەرەوە نەبوو و تەنیا گەورەی و شکۆی دەربارەی خۆیان دەوێ، شکستیان قبووڵ کرد و هیواداربوون کە داگیرکەران بەو دەستکەوتانە ڕازی بن کە بەدەستیان هێنابوو.

کاتێك کە هێزە داگیرکەرەکانی فەڕەنسا ناوچە بە پیت و بەرەکەتەکانی باشووری ڤییتنامیان داگیرکرد (١٨٥٩-١٨٦٧)، ڕێبەرانی ڤییتنام لە پایتەختی وڵات خوئە[١]، هیواداربیان دەردەبڕی کە پەلاماردەران ئەگەر وڵاتیش بەجێهێڵن لە ناوچەکانی باشوور، زیاتر پێشڕەوی ناکەن. بەڵام ئەم خەیاڵ پڵاوە بەکردەوە نەهاتەدی و فەڕەنسا لە دەیەی هەشتای سەدەی نۆزدەهەمدا دەستی بەسەر ڤییتنامدا گرت[٢]. دەسەڵاتداریێتی داگیرکەرانەی فەڕەنسا لە ڤییتنامدا شتێك زیاتر لە پێکهێنانی سیستەمێکی کۆلۆنیالی بوو، چونکە بە شکستهێنانی ڤییتنام، ڕیژیمی زاڵ بەسەر ئەم وڵاتەدا ئەو قەدر و قیمەتەی نەماو بەدوای ئەودا ڕەوتێکی ڕووناکبیری دەستیپێکرد، کە بووە هۆی گەورەترین شۆڕش و ئاستی ناوچەدا. ڤییتنام لە سەرەتای پەلاماری فەڕەنسادا حاڵەتێکی دژ بەیەکی هەبوو لەلایەك هەڵسوورو لە لایەکی دیکەوە تووشی وەستان ببوو. پەلامارە یەك لە دوای یەکەکانی ڤییتنام بۆ سەرزەوییەکانی ڕۆژهەلاتی بەردەم چۆمی مەکونگ نیشانەیەکی بەرچاوی هەڵسووڕبوونی و داخراوبوونی سیستەمی حکوومەتی نیشانەی وەستانی ئەو وڵاتە بوو. ڤییتنام لەژێر دەسەڵاتی کەسانێکدا بوو کە ئاگایان لە دونیا نەبوو و خزابوونە نێو کۆنە دونیای خۆیانەوە. پەلاماری فەڕەنسا قەبارەی جوگرافیایی ڤییتنامی دیارینەکرد، چونکە پێش هێرشی

(1) Hue.
(2) Buttinger, J., A Dragon Embattled: A History of colonial and Post-Colonial Vietnam, 2 vols, New York, 1985.



داگیرکەران سنوورەکانی ڤییتنام دیاری کرابوون و لەم لایەنەوە دۆخی ڤییتنام بە پێچەوانەی وڵاتانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بوو کە سنوورەکانی ئەوان لە قۆناغی داگیرکارییەکانی ئەوروپادا دیاری کرابوو. سەرەڕای ئەمە، ڤییتنام سیستەمێکی حکوومەتی لە مێژینەی هەبوو. فەڕەنسا بەهێرشی بەربلاوی بۆ سەر ئەم وڵاتە سیستەمی پێشووی لەنێو برد و ڕژێمێکی نیمچە نەریتی بەڵام لە کردەوەدا بێگانە لە باتی ڕژێمی پێشوو دامەزراند. فەڕەنسییەکان کە ڤییتنامییەکانیان لە ئاستی خۆیاندا نەدەدی و ئەوانیان بە فەرمانبەری خۆیان دەزانی بە لەبەرچاونەگرتنی سەربەخۆییخوازی ئەوان، بواریۆان بۆ بەشکۆترین شۆڕش لە مێژووی ناوچەدا خۆش کرد.

### ٣- کامبۆدیا:

کامبۆدیا لە بەراورد لەگەڵ دوو وڵاتی بێرمە و ڤییتنامدا گرینگییەکی کەمتری هەیە. شتێك لە شکۆ و گەورەیی پێشووی ئەم وڵاتە بەجێ ماوە و تەنانەت ئەو سەرزەوییانەی کە ئاسەواری پەرستگە بەشکۆ و گەورەکانی ئەم وڵاتەی لەخۆدەگرت لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا لەژێر دەسەڵاتی کامبۆدیا هاتەدەر و درایە تایلەند. کامبۆدیا لە ئاڵۆزی و ململانێی نێوان تایلەند و ڤییتنام توانی مانەوەی خۆی بپارێزێ. ئەم دوو هێزە گەورەی ناوچە بڕیاریان دابوو کامبۆدیا وەك ناوچەی لەمپەر لە نێوان خۆیاندا ڕابگرن. چونکە بۆ داگیرکردنی ئەو وڵاتە هیچ لایەکیان لەویتر بەهێزتر نەبوو، بەڵام ئەم بارودۆخە کاتیی بوو و بەهاتنی لایەنێکی نوێ واتە فەڕەنسا بۆ ناوچە، بارودۆخی کامبۆدیا گۆڕا. دوو وڵاتی تایلەند و ڤییتنام لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا زنجیرەیەك بێ ئاکامیان لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی تایلەند دەستپێکرد کە لەم نێوەدا دەوڵەتی کامبۆدیا بە کردەوە چاولێکەر بوو. دوای ئەوە بەشێوەی کاتی بەم ئاکامە گەیشتن کە مانەوەی کامبۆدیا بە قازانجی هەردووکیانە و ئەم وڵاتە دەتوانێ بۆ هەردوولا ڕۆڵی باجدەر بگێڕێ.

بە سەرنجدان بەم بارودۆخە و بەپێی ڕووداوە مێژووییەکان دەتوانین بە جورئەتەوە بڵێین، کە کامبۆدیا بۆ مانەوەی خۆی قەرزداری هاتنی فەڕەنسا بوو بۆ ئەو ناوچەیە، چونکە کامبۆدیا وەك ناوچەیەکی لەمپەر نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر، درێژە بە تەمەنی خۆی بدا. لەڕاستیدا، بڕیاری فەڕەنسا لە ڤییتنام، لەسەر بنەمای پەرەپێدانی دەسەڵاتی کۆلۆنیالی لە دەیەی ١٨٦٠دا، دەتوانێ وەك دەستەبەری مانەوەی کامبۆدیا لێکبدرێتەوە. جگە لەوە فەڕەنسا

هەڵسوکەوتێکی باشی لەگەڵ رێبەرانی کامبۆدیادا هەبوو و سیستەمی دواکەتوو و نەریتی پێشووی وەك فەرمانبەری فەڕەنسا لە کامبۆدیا دەپاراست. کەواتە، تاج و تەختی حکوومەتی کامبۆدیاش قەرزداری فەڕەنسایە و لەم رووەشەوە بارودۆخی کامبۆدیا لەگەڵ بێرمە و ڤییتنام بە تەواوی جیاوازە، چونکە بەریتانیا بە کردەوە کۆتایی بە سیستەمی پاشایەتی بێرمە هێنا و فەڕەنسەش بەشێوەیەك سیستەمی کۆنی ڤیەتنامی لە رەگەوە دەرهێنا، کە نەیتوانی جارێکی دیکە خۆی لەو بارودۆخە رزگار بکا و شکۆی رابردووی زیندوو بکاتەوە[1]. فەڕەنسا بە ئەنقەست یان بە هەڵە هاریکاریی رێبەرانی دواکەوتووی کامبۆدیای کرد تا بەڕواڵەت دەسەڵاتی سیاسی وڵات بگرنە دەست.

**٤- لاوس:**

کاتێك دوو هێزی گەورەی داگیرکەر لە سەدەی نۆزدەهەم واتە بەریتانیا و فەڕەنسا بەدوای ئامانجەکانی خۆیان لە ناوچەدا بوون، ئەم دوو سەرزەوییە تێکەڵی ئاڵوگۆڕەکانی ناوچەکە نەبوون. یەکێك لەو دووانە تایلەند بوو. تەنیا وڵاتێك کە توانی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ و هیچ کات بەشێوەی فەرمی نەبووە وڵاتێکی داگیرکراو. سەرزەوییەکی دیکە، ناوچەیەکە کە دواتر پێیان دەگووت لاوس.

لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا وڵاتێك نەبوو ناوی لاوس بێ، تا کۆتایی ئەم سەدەیە لە ناوچەیەکدا، کە دواتر بەم ناوە ناسرا کۆمەڵە حکوومەتێکی پرس و بڵاوی بچووك بوون، کە هیچ کامیان نەیاندەتوانی بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵبێ. لە نەریتی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیادا حکوومەتە لاواز و بچووکەکان کە بۆ نموونە لە ناوچەی لاوسدا بوون. دەبوایە باجیان بە دەسەڵاتە گەورەکانی ناوچە بدایە و هەندێك جار رێکدەکەوت کە بۆ مانەوەی خۆی تەنانەت باجی بە چەند دەسەڵاتێکی ناوچەیی دەدا. هەوڵ و ململانێی وڵاتە زلهێزەکان، ئەم ناوچەیەی لە پرش و بڵاوییەوە گۆڕی بۆ وڵاتێکی یەکگرتوو. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا کێبەڕکێ دوو هێزی گەورە، بەریتانیا و فەڕەنسا، لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. کاتێك بەریتانیا دەسەڵاتی خۆی بەسەر بێرمەدا سەپاند، فەڕەنسا، ڤییتنام و کامبۆدیای داگیرکرد، لەسەر ئەوەی کە چوارچێوەی

(1) Ibid, p131.



دەسەڵاتی ئەم دوو وڵاتە هەتا کوێ پەرەبستێنێ باسێکی توندی لەنێوان داگیرکەرانی ئەورووپایی دروستکرد. ئەم بارودۆخە ئاڵۆز بوو، هەروەها کێشەی نێوان داگیرکەران هەم قازانجی تایلەند و هەم بە زیانی ئەو وڵاتە بوو. تا کاتێك کە تایلەند وەك وڵاتێکی سەربەخۆ لە نێوان ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا و فەڕەنسا مابوو، لە ململانێی نێوان دوو وڵاتی زلهێزدا سوودمەند بوو و سەربەخۆیی خۆی دەپاراست. بەڵام بۆ پاراستنی ئەم سەربەخۆییە دەبووایە نرخی بدایە و نرخەکەی لەدەستدانی چەند بەشێك لە وڵاتەکەی بوو. زلهێزە دەرەکییەکان لەگەڵ تایلەنددا رێککەوتنامەی بازرگانی یەك لایەنەیان ئیمزاکرد، کە هەموو قازانجی ئەوان بوو. جگە لەوەش هاووڵاتیانی وڵاتە بیانییەکان توانییان لە مافی کاپیتولاسیۆن کەڵك وەربگرن. بەڵام دەرەتانێك کە تایلەند بۆ پاراستنی سەربەخۆییەکەی هەبوو، لاوس نەیبوو. لە ناوچەیەکدا کە دواتر ناویان نا لاوس، بە کردەوە یەکگرتنێك لە نێوان رێژیمە پەرش و بڵاوەکاندا نەمابوو و هەریەکەیان بۆ پاراستنی مانەوەی خۆی دەبووایە باج بە یەك یا چەند دەسەڵاتی بەهێز بدا. جگە لەوەش، ناوچەی ئاماژەپێکراو بەهۆی هێرشی پەنابەرانی چینی و ئەو رێگرانەی کە لە چینەوە هاتبوونە ناوچە، بەردەوام تووشی ئاڵۆزی و پشێوی دەبوو. لاوازی و پەرش و بڵاوی هۆکارێك بوون کەوای لە داگیرکەران دەکرد بەرامبەر بە لاوس چاوچنۆکیی زۆرتریان بێ. فەڕەنسا لە نێوان ساڵەکانی ١٨٨٥-١٨٨٩ هەلەکەی قۆزتەوە و بە خێڵ و تەڵەکە و بە پشت ئەستووربوون بەهێزی کۆلۆنیالی خۆی بە بیانووی ئەوەی، کە لاوس لە رابردوودا بەشێك لە ڤییتنام بووە، ئەو وڵاتەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بەم شێوەیە، هێرشی ئەم داگیرکەرە ئەورووپاییە بووە هۆی پێکهێنانی حکوومەتێك کە پێشتر لە ناوچەدا بوونی نەبووە، بەڵام دوای ئەوە سەرەڕای هەموو ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ناوچە هەروا لە جێی خۆیدا مایەوە[1].

**٥- تایلەند:**

لە باسەکانی پێشوودا ئاماژەمان بەوە کرد کە تایلەند لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا تەنیا وڵاتێك بوو، کە هیچ کات نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی وڵاتە زلهێزەکانەوە، دیارە پێویستە سەرنج بدرێتە ئەوەی کە نەمانی دەسەڵاتی بەو مانایە نییە، کە هیچ شتێك کاری تێناکا. تایلەند و ڤییتنام دوو وڵاتی گرینگ و سەرکەوتووی ناوچەبوون، بەڵام تایلەند بە

(1) Osborne, Milton, Southeast Asia, Allen and Unwin, London, 1986, p. 69.

پێچەوانەی ڤییتنام توانی کیانی خۆی بپارێزێ و نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی وڵاتە زلهێزەکانەوە. هەندێك لەو هۆکارانەی کە لەم پێوەندییەدا کاریگەربوون بریتییە لە: ١- تایلەند بە درێژایی ململانێی دوو هێزی داگیرکەر وەك ناوچەی لەمپەر لە نێوان ئەو دوو هێزەدا ناسرا[1]. ٢- ئەم وڵاتە لەلایەن ڕێبەران و سیاسەتمەدارانی لێهاتووی دەوڵەتییەوە ئیدارە دەکرا. بەراوردکردنێك لەنێوان بێرمە و تایلەند نیشاندەری بارودۆخی جیاوازی ئەو دوو وڵاتەیە. کاتێك کە ڕێبەرانی بێرمە لە هێرشی بەربڵاوی بەریتانیا غافڵ بوون و بەرگرییان لە خۆیان نەکرد، بەرپرسانی تایلەند لە پاشاوە بگرە هەتا کاربەدەستانی خوارەوەتر خەریکی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆکی هێزە ئەوروپاییەکان بوون، هەتا ئاگاداری ئەو پێشکەوتنە زانستی و کردەوەییانە بن کە بووەتە هۆی بەهێزبوونی ئەو وڵاتانە.

مونگوت[2] (حکوومەت ١٨٥١-١٨٦٨) لەم ڕووەوە خزمەتێکی شایستەی کردووە. بۆ نموونە سیاسەتە باشەکانی مونگوت بووە هۆی دەسراگەیشتنی ئەم وڵاتە بە زانست و پیشەسازی، هەروەها خۆپاراستن لەو کارانەی کە دەیتوانی بیانو بداتە دەست ڕۆژئاواییەکان هەتا هێرش بکەنە سەر ئەم وڵاتە. نەوەکەی چولەلانگورن، ئەویش ڕێچکەی ئەوی گرتەبەر. ئەم دوو ڕێبەرە بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانجەکانیان سوودیان لە ئەزموونی زانایان وەرگرت.

بەڵام بە هەموو ئەم کارانە تایلەند نەیتوانی بە تەواوی پێش بە سیاسەتی هێزە ئەوروپاییەکان بگرێ و نەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوان، لەسەر بڕیاری دەوڵەتی فەرەنسا بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی لە هیند و چیندا، تایلەند دەسەڵاتی هەندێك لە ناوچەکانی خۆی لەدەستدا، ئەو ناوچانەی کە بە درێژایی چۆمی مکونگ لە لاوس و ئوستانەکانی ڕۆژئاوای کامبۆدیا پێش سەدەیەك لەبەردەستی دابوو. پاش ماوەیەك لە ساڵی ١٩٠٩ تایلەند دەسەڵاتی بەسەر چوار هەرێمی باکوور کە جێی حەوانەوەی مالییەکان بوو، نەماو هەرێمەکانی پرلیس[3]، کدا[4]، کلانتا[5] و ترانگانۆ[6] کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بەریتانیا و پاشان سەربەخۆیی مالیزیا لە ساڵی ١٩٥٧ وەك بەشێك لەم وڵاتە ناسێندرا.

(1) Wyatt, D. K., Thailand: A short History, New Haven, Conn. 1989, P.172.
(2) king Mongkut.
(3) Perlis.
(4) Kedah.
(5) Kelautan.
(6) Trengganeau.



بەهەرحاڵ لەگەڵ ئەوەی کە تایلەند هیچ کات بەشێوەی ڕاستەوخۆ نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی وڵاتە زلهێزەکان، بەڵام لە ئاسەواری هێرشی بەربڵاوی کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاوا نەپارێزرا، بەشێك لە خاکی خۆی لە دەستدا و ناچارکرا ئیمتیازگەلێکی گەورە بەو وڵاتانە بدا. بەڵام ڕێبەرە وشیارەکانی ئەم وڵاتە، پاش ئاگاداربوون لە هۆکارەکانی زاڵبوونی هێزە کۆلۆنیالەکانی ڕۆژئاوا، زانست و پیشەسازی ئەوان فێربوون، تەنانەت ڕاوێژکارە ڕۆژئاواییەکانان خستە خزمەت خۆیانەوە.

### ب) وڵاتە ئاوی خاکییەکان:

### ١-ئەندونزیا:

پاش لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەو ئاکامە گەیشتین کە تەمەنی حکوومەتە کۆلۆنیالیزمەکان لە هەندێك شوێن شەست ساڵ بووە، لە حاڵێکدا لە ئەندونزیا زیاتر لە سێ سەد ساڵی خایاندووە، بەم پێیە شکڵی کۆلۆنیالیزم و شێوەی خەباتکردن لەگەڵیدا لەم وڵاتە جیاوازە. سەرەتا، هێرشی هۆڵەندا بۆ وڵاتی ئەندونزیا بەرەبەرە و بەشێوەی پچرپچڕ بووە بەڵام لە شازدە ساڵی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا، لایەنی ئەم هێرشانە پەرەی ئەستاندووە. هۆڵەندییەکان بە بیانووی بازرگانی کردن پێیان نایە ئەم کۆمەڵە دوورگەیەوە و لە سەرەتادا مەبەستیان دەست بەسەرداگرتنی باکووری دوورگەی جاوە و شوێنە سەرەکییەکانی دیکەی ئەو وڵاتە بووە، کە لەواندا بازرگانی بەهارات برەوی هەبووە. هۆڵەندا سەرەتا کۆمپانیایەکی بازرگانی بەناوی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندا لە ئەندونزیا دامەزراند، وەکو ئەو کارەی کە بەریتانیا لە هیندستان ئەنجامیدا پاشان، بەرەبەرە دەسەڵاتی سیاسی و بازرگانی بەدەست هێنا. کاتێك کە ململانێی سیاسییەکانی ڕێبەرانی جاوە لە سەدەی هەژدەهەم ڕووخانی حکوومەتی ((ماتارام))ی لێکەوتەوە، هۆڵەندا بە کەڵکوەرگرتن لەو ئەزموونانەی کە بە درێژایی دەسەڵاتی لە ئەندونزیا بەدەستی هێنابوو لە دیاریکردنی جێنشینی حکوومەت ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕا.

بەو سەردەمەدا پایتەختەکانی جاوە بە ناوەکانی یوگ یاکارتا و سوراکارتا (سولو)[1] لەژێر دەسەڵاتی هۆڵەندییەکاندا بوون.

(1) Surakarta (Solo).

لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمدا، کۆمپانیای هۆڵەندی هیندی ڕۆژهەڵات توانی بەشێکی سەرەکی لە دوورگەی جاوە بخاتە ژێر دەسەڵاتی سیاسی خۆی هۆڵەندییەکان بە بەکارهێنانی دەسەڵاتدارە خۆماڵییەکان و وەرگرتنی باج، کە چینییە پەنابەرەکان بەرپرسی کۆکردنەوەی بوون، توانییان سەروەت و سامانی خەڵکی ئەم وڵاتە بە تاڵانی بەرن. بەشی زۆری فشارەکان لەسەر شانی خەڵکی گوندەکان بوو کە بە بەرهەمهێنانی چەند قات، زیاتر دەچەوسانەوە. بەهۆی پێکهاتەی نەریتی کۆمەڵگای ئەندونزیا و کاریگەریی ئەفسانە و خورافات، ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکانی هۆڵەندا نەبووە هۆی گەڕان لە قەوارەی کۆمەڵایەتی و نەریتی خەڵکی ئەم وڵاتە. ئیسلامیش نەیتوانی بەسەر ئەم خورافاتانەدا زاڵ بێ و تەنانەت تاڕادەیەکیش کەوتە ژێر کاریگەری ئەو، چونکە ئێستاش لە ئەندونزیا نەریت بەسەر مەزهەبدا زاڵە[١]. هۆڵەندا بە کەڵکوەرگرتن لەم خورافاتە پڕوپووچانە ٣٥٠ ساڵ بەسر ئەندونزیادا حکوومەتی کرد و ئەگەر هێرشی ژاپۆن نەبووایە زیاتر لەم وڵاتەدا دەمایەوە.

بوونی کۆلۆنیالیزم لە شوێنەکانی دیکەی وڵاتیش هەست پێدەکرا. لە سەدەی نۆزدەهەمدا ناوچەکانی دیکەی وڵاتی سێزدە هەزار دوورگەیی ئەندونزیا، بێجگە لە دوورگەی جاوە، بەرەبەرە لەلایەن هۆڵەندەوە داگیرکرا. بەربەرەکانی لەگەڵ ڕژێمی کۆلۆنیالیزمدا بووە دیاریدەیەکی ئاشکرای سەدەی نۆزدە و بیست. هێرشی بەربڵاوی هۆڵەندا دەگەڕایەوە بۆ چوونە سەری داواکاری بۆ بەروبوومی ناوچە وشکانییەکان، هەروەها هەڵسووڕانی ڕوو لە گەشەی هێزە دەرەکییەکانی دیکە لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا[٢]. فشاری ئابووری و کێبەڕکێی ئابووری بووە هۆی ئەوەی کە هۆلەندا دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەندونزیادا ئاشکرا بکا و بەجێگای کۆمپانیاکان وەك کۆمپانیای هۆڵەندی هیندی ڕۆژهەڵات، خۆی کاروباری وڵاتی گرتە دەست. ئەم کارە شەڕوپێکدادانی نێوان هۆڵەندا و هێزە خۆماڵییەکانی لێکەوتەوە. هۆڵەندا لە ناوچەی سوماترا[٣] چەندین دەیە شەڕی کرد، هەتا توانی دەستبەسەر ناوچەی گرینگ و ستراتیژی گەرووی مالاکادا بگرێ. (سوماترا ئەندونزیا ناوچەی هەڵسووڕانی موسڵمانە نارازییەکان بوو. شۆڕشی

(1) Legge, J. D., Indonesia, 2nd ed., Sydbey, 1987, p. 222.
(2) Ricklefs, M. C., A History of Modern Indonesia, London 1991, pp. 198-199.
(3) Sumatra.



موسڵمانەکان لە ساڵی **١٩٥٨** دژی حکوومەتی سیکۆلاری سوکارنۆ و لەسەر کارلابرانی محەممەد هاتا جێگری سەرۆك کۆمار بوو، هەروەها شۆڕشی ئێستای ناوچەی ئاچە لە باکووری سوماترا، کە بە لێکدانەوەی حکوومەتی ئەندونزیا شەڕی بناژۆ ئیسلامییەکانە لەگەڵ هێزە دەوڵەتییەکان ئەمانە چەند نموونەیەکن لە ڕووداوەکانی ئەم ناوچەیە.

هۆڵەندا بە شەڕێکی قورس دوورگەی بالی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و سەرئەنجام لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدوای پەلامارە یەك لە دوای یەکەکانیدا هۆڵەندا توانی ناوچەکانی ئەندونزیا لە سوماترا هەڵکەوتوو لە ڕۆژئاوا هەتا ناوچەی ڕۆژئاوای گینەی نوێ لە ڕۆژهەڵات داگیربکا و تەنیا ناوچەی تەیموور لەژێر دەسەڵاتی پورتوگاڵدا بوو. پورتوگال کە تەنیا دەسەڵاتی بەسەر بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەم دوورگەیەدا هەبوو، لە ساڵی **١٩٧٥** بەدوای ڕێککەوتننامەیەك تەسلیمی دەوڵەتی جاکارتای کردەوە. (لەم ناوچەیەدا بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی فری تیلین[١] هێشتا بەردەوام. ئەم بزووتنەوەیە خوازیاری سەربەخۆیی ئەم دوورگەیەیە و هەموو کاتێك لەلایەنە هێزە دەوڵەتییەکانەوە سەرکوت دەکرێ). هۆڵەندا لە ناوچەیەك بە گەورەیی و بەرفراوانی ئەندونزیا بە یەك شێواز هەڵسوکەوتی نەدەکرد، بۆ وێنە لە ناوەند و ڕۆژهەڵاتی جاوە بانگهێشتن بۆ مەسیحییەتی دەکرد و لە شوێنەکانی دیکە بەجۆرێکی دیکە ڕەفتاری دەکرد.

بەڵام کاریگەریی بەرچاوی هۆڵەندا لە ئەندونزیا بزواندنی هەستی نەتەوەیی و پاراستنی قازانجی هاوبەشی بوو. هۆڵەندا بەکردەوە بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی ئەم وڵاتە بەدوای پێکهێنانی یەکیەتی لەنێوان ناوچە پەرش و بڵاو و دوورکەوتووەکانەوە بن. دوای چەندین سەدە، بیرۆکەی کۆن و نەریتی نوسانتارا[٢]، واتە ((ئیمپڕاتۆری دوورگە)) سەرلەنوێ لەم وڵاتەدا زیندوو بووەوە دەسەڵاتە بێگانەکان دەستیان کرد بە پاراستن و سەقامگیرکردنی سنوورەکانی ئەم وڵاتە، هەروەها ڕێکخستن و لە کۆتاییدا دامەزرانی کۆماری ئەندونزیا بە دەست) و بە توانای خەڵکی لێکەوتەوە.

(1) Frietilin.
(2) Nusantara.

## ٢- مالیزیا، سەنگاپوور، بڕۆنی:

مێژووی دروستبوونی وڵاتی سەربەخۆی مالیزیا وەك ئەندونیزیایە، واتە بارودۆخی ئێستا و دیاریکردنی سنووره جوگرافیاییەکانی بۆ سەردەمی کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە. لەرابردوودا، مالیزیا بەشێك بووە لە سەرزەوی گەورەی ئەندونیزیا-مالی. دەسەڵاتدارانی مالی حکوومەتیان بەسەر ئەو هەرێمانە دەکرد کە لەڕووی پانتاییەوە جیاوازییان هەبوو وەك لێوارەکانی نیمچە دوورگەی مالایا، ناوچەکانی باکووری دوورگەی برنئۆ و ڕۆژهەڵاتی سوماترا، کە دواتر کەوتە ژێر دەسەڵاتی هۆڵەندا. خەڵکی غەیره مالایی لە ناوچەکانی نیمچە دوورگەی مالایا و لە دوورگەی برنۆ دەژیان. لە رابردوودا ئەو ناوچەیەی کە ئێستا لەژێر چاودێری کوالالامپور دایە، چەندین حکوومەتی ناسەقامگرتوو رکەبەرایەتی یەکتریان دەکرد و دەسەڵات لە نێوانیاندا ئەم دەست ئەو دەستی دەکرد. ناوچەکانی باکووری نیمچە دوورگەی مالایا لەژێر دەسەڵاتی رێبەرانی تایلەنددا بوو و باجیان لە خەڵکەکەی وەردەگرت، لەم سەردەمەدا شانشینەکانی باکووریش لەژێر چاودێری دەسەڵاتدارانی ناوچەیەکدا بوون کە ئێستا پێی دەڵێن ئەندونزیا[1].

پەرەسەندنی دەسەڵاتی ڕۆژئاوا لەم ناوچەیەدا بەرەبەرە کەوتە مەترسییەوە. پورتوگالییەکان کە لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا مالاکایان داگیرکرد، هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم مەبەستیان داگیرکردنی مالیزیا نەبوو.

یەکەمین ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا دوورگەی پی نانگ[2] هەڵکەوتوو لە باکووری ڕۆژئاوای نیمچە دوورگەی مالایا، بوو کە لە ساڵی ١٧٨٦ لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکرا. لە ساڵی ١٨١٩ سەنگاپووریش دوای پی نانگ کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا. لە دەیەی ١٨٣٠ دەسەڵاتی بەریتانیا لە سێ ناوچەی سەنگاپوور، پی نانگ و مالاکا لە پەراوێزی نیمچە دوورگەی مالایا سەقامگیر بوو. ئەم ناوچەیە نەتەنیا لەڕووی جوگرافیاییەوە لە پەراوێزدا هەڵکەوتبوو، بەڵکو لە بواری پێوەندی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ((مالی))یش ڕۆڵی لاوەکی هەبوو. ناوچەکانی گەروو[3] کە لە سێ هەرێم پێکهاتووه بەشێکی بچووك لەسەر زەوی مالی

(1) Allen, C. ed., Tales from the South China Seai, London, 1985.
(2) Penang Island.
(3) The straits settlements.



پێکدێنن[1]. حەشیمەتی ئەم ناوچانە بەهۆی کۆچی چینییەکان و پاشان هیندییەکانەوە رووی لە زیادبوون کرد، کە لەلایەنە بەریتانیاوە هان درابوون، ئەم رەوتە بۆ بردنەسەری ڕێژەی خەڵکی مالی نەبوو، چونکە خەڵکی ئەم ناوچەیە کە بە منداڵەکانی زەوی[2] ناسراون، بۆ خۆیان لەژێر فشاری بەریتانیا ناچاربوون بۆ شوێنەکانی دیکە کۆچ بکەن. بەرەبەرە پێوەندیەکی نزیك لە نێوان بەریتانیاو دەسەڵاتدارانی مالی دروستبوو، بەشێوەیەك کە دەسەڵاتدارانی مالی لە مەسەلە ئابوورییەکاندا هاریکاری نزیکی بەریتانیایان دەکرد. ناوچەکانی گەروو بەکردەوە ببوون بە پێگەیەك کە لە ڕێگای ئەوانەوە بازرگانەکان، خاوەن کانزاکانی قەڵای (قلع)، کرێکاران، بەرەبەرە قەوارەی ئابووری نیمچە دوورگەی مالایایان گۆڕی بە هەڵایسانی جەنگی یەکەمی جیهانی، بەریتانیا نەتەنیا بەسەر ناوچەکانی گەروو، بەڵکو بەسەر تەواوی ناوچەدا زاڵ بوو. کێشەی سەرەکی ناوچە نەبوونی یەکیەتی بوو کە هۆکارەکەی بۆ سیاسەت و دنەدانەکانی بەریتانیا دەگەڕایەوە[3]. هاتنی کۆچبەرانی چینی کە بەردەوام رووی لە زیادبوون بوون و تەنانەت ژمارەیان لە خەڵکی خۆجێی ناوچەکانی دوورگە زۆرتر بوو، یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی کێشە و گیرگرفت بوو. سەرئەنجام بوونی بەریتانیا لەم ناوچەیە و پێداگری ئەم وڵاتە بۆ دیاریکردنی سنووری نوێ، بووە هۆی دروستبوونی وڵاتێکی نوێ ئێستا بەناوی مالیزیا دەیناسن.

بە خوێندنەوەی زیاتری مێژووی مالایان ڕۆڵی هێزە ئەوروپاییەکان لە پێکهێنانی سنووره نوێیەکان بە تەواوی دیارە. لەم پێوەندییەدا ئاماژە بە چەند نموونە دەکەین، کە بە چ شێوەیەك ئەوروپاییەکان ناوچەیەکیان دەخستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و سنووریان بۆ دیاریدەکرد. ئەم ناوچانە بریتیبوون لە: سەبا، ساراواك و بڕۆنی. ئەم ناوچانە لە باکووری دوورگەی برنۆ هەڵکەوتوون. ئەوروپاییەکان بۆ دەستراگەیشتن بە قازانجە ئابووری و ناوچە ستراتیژییەکان، پەلاماری باکووری ((برنۆ)) یاندا. ئەم پەلامارە شانشینی بڕۆنی زیاتر لاوازکرد. حکوومەتی بڕۆنی کە کۆنترین حکوومەتی ئەم ناوچەیەیە و هێشتاش دەسەڵاتی

(1) Turnbull. C. M, The Straits Settlements 1826-1867, London, 1972. p. 66.
(2) Bumiputra.
(3) Emerson, R. Malaysia: Astudy in Direct and Zndilect Rule, Kuala Lumpur, 1984, p.102.

ماوە، لەرابردوودا بەدرێژایی سنووری برنۆ و نیمچە دوورگەی سولو دەسەڵاتێکی زۆری بووە. لەم پەلامارەدا دوو ناوچە کە ئێستاش بەشی رۆژهەڵاتی مالیزیا پێکدێنیێ. لەژێر چاودێری دوو هێزی داگیرکەردابوو، برۆنی لە ساڵی ١٨٨٨ بە ناوچەی ژێر چاودێری بەریتانیا ناسرا بوو و ئەم بارودۆخە تا ساڵی ١٩٨٤ کە سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێنایەوە، درێژەی کێشا. لە ساراواك هۆکاری کۆلۆنیالیزم بەشێوەی راستەوخۆ خودی دەوڵەت نەبوو، بەڵکو کەسێك بوو بەناوی جەیمز برووك. ناوبراو یەکەمین سپی پێستێك بوو کە پێی نایە ساراواك، دواتر چەندین کتێب و گەلێك وتار لەو پێوەندییەدا نووسراوە. هۆکاری کۆلۆنیالیزم لە سەبایش کۆمپانیایەکی بازرگانی بوو بەناوی کۆمپانیای چارتروی باکووری برنۆ. لە هەردوو حاڵەتدا لەگەڵ بەریتانیا پێوەندی ناڕاستەوخۆی دامەزرا بوو. لە دوو ناوچەی باکووری برنۆ، وەك ناوچە داگیرکراوەکانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، هێرشی بەربڵاوی ئەورووپاییەکان بووە هۆی پێکهێنانی سنوور و رژێمە سیاسییە نوێیەکان.






Source: *Atlas of Southeast Asia*; p. 77.

**نەخشەی قۆناغە جیاجاکانی دروستبوونی دوورگەی مالیزیا**

### ٣- فیلیپین:

ئەوەی کە سەبارەت بە کاریگەریی ئەوروپاییەکان لە دیاریکردنی سنووری ئەندونیزیا و مالیزیا ئاماژەی پێکرا، لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتی فیلیپین ڕاستە. دەسەڵاتی درێژماوەی ئیسپانیا لە دوورگەکانی فیلیپین بووە هۆی ئەوەی کە سنوورەکانی ئەم وڵاتە دیاریبکرێ، چونکە پێش هێرشی ئیسپانیا وڵاتێك بەو ناوە نەبووە. ئیسپانییەکان بەرەبەرە دوورگەکانی فیلیپینیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. کەوابوو مانەوەی حکوومەتی داگیرکەری ئیسپانیا لەم وڵاتە ڕەوتێکی درێژخایەن و لەسەرخۆی بووە. لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم ئیسپانیا توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچە نزمەکانی باکووری فیلیپین بسەپێنێ، بەڵام ناوچە بەرزەکان هەروا لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئیسپانیادا بوو. جگە لەوەش ناوچە موسڵماننشینەکانی باشووری ئەم وڵاتەش هیچ کات بەتەواوی نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیا و هەوڵە بەردەوامەکانی ئیسپانیا بۆ دەستبەسەرداگرتنی شانشینەکانی ئەم ناوچەیە شکستی خوارد. چەند بەشێك لە لێوارەکانی باشوور وەك زامبوانگا داگیرکرا، بەڵام دەسەڵاتدارانی دوورگەی سولود دەسەڵاتدارانی ناوچەکانی دیکە کە بەرامبەر بە دەسەڵاتدارانی سولو گرینگییەکی کەمتریان هەبوو، هیچ کات دەسەڵاتی ئیسپانیایان قبووڵ نەکرد، هەربۆیە جیاییخوازیی موسڵمانەکان و بزووتنەوەی نەتەوایەتی مۆرۆ، ڕابردوویەکی دوورودرێژی هەیە و دیاردەیەکی نوێ نییە.

لەگەڵ ئەوەی وێکچوونێك لەنێوان کۆلۆنیالیزم لە ئەندونیزیا و مالیزیا و کۆلۆنیالیزم لە فیلیپین دەبینرێ، بەڵام ئیسپانیا مەسەلەیەکی نوێی لە فیلیپین هێنایە بەرباس کە لە ناوچەکانی دیکەدا وێنەی نەبوو، ئەم مەسەلە گرینگە مەسیحییەت بوو. هەرچەند هێزە داگیرکەرە ئەوروپاییەکان لە ناوچەکانی دیکەدا بەتایبەت لە ڤییتنام هەوڵیاندا ئایینی خۆیان بسەپێنن، بەڵام لە هیچ ناوچەیەك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بێجگە لە فیلیپین مەزهەبی داگیرکەران بە تەواوی نەبووە مەزهەبی ئەو وڵاتانەی داگیریان کردبوو (دیارە ئەمە پێوەندی بە باکووری فیلیپینەوە هەیە نەك باشووری ئەو وڵاتە کە ئیسلام پێش هاتنی ئیسپانیا لەوێ پێگەیەکی پتەوی دەستهێنا بوو). هاتنی مەزهەبی کاتۆلیك بۆ ناوچەکانی باکوور دەتوانین وەك دەستنیشان کردنی قەوارەیەکی نوێ بۆ کۆمەڵگای فیلیپین چاو لێبکەین. ئیسپانیاییەکان بەدوای دامەزرانی قەوارەگەلی غەیرە خۆماڵیدا بوون، بەڵام نەیانتوانی تەواوی لایەنە خۆماڵییەکانی کۆمەڵگا لابەرن. سەرەڕای ئەمەش، لە سیستەمی ئیداری و ئابووری فیلیپیندا



کاریگەرییەکی هەمەلایەنەی هەبووە، بەشێوەیەك کە وڵاتە زلهێزە ئەوروپاییەکانی دیکە لە هیچ یەك لە وڵاتانی ناوچە نەیانتوانی تا ئەم ئاستە بچنە قووڵایی کۆمەڵگاوە.

پێشتر ئاماژەمان بە دژکردەوە و دەربڕینی ناڕەزایەتی خەڵکی فیلیپین بەرامبەر بە دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی ئیسپانیا کرد. ئەم ناڕەزایەتییە کاتێك پەرەی ئەستاند، کە ئیسپانیاییەکان بە کەڵکوەرگرتن لە مافی شارستانی و مەزهەبی لە نێوان ئێندیۆس[1]، واتە دانیشتووانی خۆجێی دوورگەی فیلیپین و ئیسپانیاییەکان جیاوازییان دادەنا. ئیندیۆس کە داوای مافی خۆیان دەکرد، لە بنەڕەتدا دەرچووی قوتابخانەکانی ئیسپانیا بوون، ئیسپانیا لە فیلیپین دۆخێکی پێکهێنا بوو کە لە ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وێنەی نەبوو. لە سەدەی نۆزدەهەمدا فیلیپینییە چەوساوەکانی دژی دەسەڵاتی ئیسپانیا ڕاپەڕین، چونکە ئیسپانیاییەکان بە سووك سەیریان دەکران. خەڵکی فیلیپین بەدوای ناسنامەی نەتەوەیی خۆیاندا دەگەڕان بە واتایەکی دیکە تێدەکۆشان تا ناسنامەیەکی سەربەخۆ بۆ خۆیان بیبیننەوە، چونکە مێژووی فیلیپین بە پێچەوانەی ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا خاوەنی فەرهەنگێکی دەوڵەمەند نەبووە، کە بتوانێ لە بەرامبەر هێرشی ئیسپانیادا بیپارێزێ. لەبەر ئەم هۆیە بوو کە پێناسە نوێیەکەی بەبێ خۆڕاگری کەوتە ژێر کاریگەری ئەزموونەکانی دەسەڵاتی ئیسپانیا و مەزهەبی کاتۆلیك، بە واتایەکی دیکە پێناسەی سەدا سەد روون و خۆماڵی نەبوو.

لەم فەسڵەدا بەشێوەی گشتی ئاماژە بە پێکهێنانی هەندێك لە سنوورە نەتەوەییەکان و ڕۆڵی هێزە داگیرکەرەکان لەم پێوەندییەدا کرا. دیارە ئەم جۆرە گۆڕانکارییانە تەنیا تایبەت نییە بە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، بەڵکو وێنەی ئەو جۆرە گۆڕانکارییانە لە ناوچەکانی دیکە وەك ئەفریقا دەبینرێ.

داگیرکەرانی ئەوروپایی هەرچەند ڕۆڵی گرینگیان لە دیاریکردنی سنوورەکان و پێکهێنانی سروشتی ڕیژێمەکانی دوایی گێڕا، بەڵام لە کۆتاییدا خەڵکی خۆجێی ئەم ناوچەیە بوون کە پێوانەکانی ژیان و داهاتووی خۆیان داڕشتەوە و سەربەخۆیی بڕیاردان مەسەلەکە کە دەبێ لە لێکۆڵینەوەکانی پێوەندیدار بە هێرشی ئەوروپاییەکان و کێشەکانیان لە ناوچەدا، لەبەرچاو بگیرێ.

(1) Indios.

# فەسڵی شەشەم

## گۆڕانکارییە ئابوورییەکان پاش هێرشی ڕۆژئاوا

لە فەسڵی پێشوودا ئاماژەمان بە کاریگەریی هێزە داگیرکەرەکان لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کرد. هێرشی هێزە ئەوروپاییەکان لە سەرەتای سەدەی شانزدەهەم دەستیپێکرد و لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بەوپەڕی خۆی گەیشت. سەرەڕای ئەو کاریگەرییانەی کە ئاماژەمانی پێکرد، گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی ناوچەش یەکێك لە باسە گرینگەکانی ئەم فەسڵەیە.

لەگەڵ ئەوەی کە سەرەتای ئەم گۆڕأنکارییە لە سەدەی حەڤدەهەم و بە بەشداری بەرچاوی خەڵکی خۆجێی ناوچە بووە، بەڵام بێگومان بناغەی ئەم گۆڕانکارییە بۆ هاتنی وڵاتە زلهێزەکان و سیاسەتەکانیان دەگەڕێتەوە. بێگومان وڵاتانی داگیرکەر بەردەوام بەدوای بەرژەوەندی خۆیاندا بوون و هیچ کات قازانجی ناوچەیان بۆ گرینگ نەبووە، بەڵام مەبەستی وڵاتانی داگیرکەر و ئاکامەکەی هەرچی بێ، باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا گۆڕانێکی گەورەی ئابووری بەتایبەت کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بێوێنە بووە، بەخۆیەوە بینیووە[1].

کەسانێك کە سەفەری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیایان کردبێ بۆیان دەرکەوتووە کە جیاوازییەکی یەکجار زۆر لە نێوان ناوچە کشتوکاڵییەکان لەگەڵ ئەو ناوچانەی کە خاوەنی کانگای ژێر زەوییە، هەروەها ئەو ناوچانەی کە هێشتا وەك خۆی ماوەتەوە، دەبینرێ. لەلایەك ناوچەیەکی بەرین لەزارکی چۆمە گەورەکان بوونەتە کێڵگەی برنج، هەروەها کێڵگەی خورما و

(1) Seinberg. D. J. ed.; In search of southeast Asia: A Modern History; London 1989, pp. 218-220.



کاوچۆ و ڕووبەرێکی بەربڵاوی داپۆشیوە و لەلایەکی دیکەوە ناوچەیەکی بەربڵاو کە بە داستان داپۆشراوە بێ کەلك ماوەتەوە. کێڵگەکان، بەتایبەتی کێڵگەی کاو چۆ ناوچەیەکی تازەیە کە ڕابردووەکەی بۆ نزیك سەد ساڵ دەگەڕێتەوە.

پەرەپێدانی بەرهەمی برنجیش یەکێکی دیکە لە گۆڕانکارییە گرینگانەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەستیپێکرد و تاڕادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەوروپاییەکان لە ناوچەدا. هەرچەند بوونی کێڵگەکانی برنج لە ناوچەدا دیاردەیەکی نوێ نییە، بەڵام گۆڕانکارییە پەیوەندیدارەکان بە بەرهەمهێنانی ئەم بەرهەمە ستراتیژییە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی وڵاتە زلهێزەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا. بە هاتنی فەڕەنسییەکان لە سەرەتای دەیەی ١٨٦٠، بۆ گۆڕینی زارکی چۆمەکانی مەکونگ هەڵکەوتوو لە ڤییتنامی باکوور، لە ناوچەیەکی مرداو بۆ ناوچەیەکی بە پیت و بەرەکەت و لەبار بۆ بەرهەمهێنانی برنج، هەوڵێکی یەکجار زۆردرا. هەرچەند ڤییتنامییەکان هێزی کاری ئەم گۆڕانکارییەیان دابین دەکرد، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان کەڵکیان لە قازانجی ماڵی ئەو بەرهەمانە وەردەگرت ،چونکە ئەم گۆڕانکارییە بەرچاوە تاڕادەیەکی زۆر بەهۆی کردەوەی ئەندازیاری و لێهاتوویی ئەوروپاییەکانەوە بوو، بەشی زۆری قازانجەکەشی بەر ئەوان دەکەوت[1]. دەسەڵاتی ئەوروپاییەکان بەتایبەت فەڕەنسییەکان وایکرد بەدوای گۆڕانکاری ئابووری لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە گۆڕانێکی گرینگ لە ناوچەدا ڕوویدا. گۆڕانکاریی ئابووری بەکردەوە بووە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە وەرزێڕانی کەم داهات، هەژار و دەستکورت بن و زەوییەکانی خۆیان لەدەست بدەن و ژمارەیەکی کەمیش کە بەکردەوە بەکرێگیراوی بیانییەکان بوون، بوونە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، چ کەسانێك لەم گۆڕانکارییە ئابوورییە سوودمەند بوون؟.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە و ئاگاداربوون لە گرینگی دوو سەدەی نۆزدە و بیست لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرین، کە چالاکی ئابووری کە هاوکات بوو لەگەڵ پەرەسەندنی دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپا لەچاو ڕابردوو زۆر جیاوازبوو. لە فەسڵی یەکەمدا ئاماژە بەوەکرا کە ئیمپڕاتۆری گەورەی شری وجایا لە سەدەی هەشتەم و نۆیەم بەهۆی بازرگانی دەریایی بووە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر و گۆڕانکارییەکی ئابووری بەرچاوی لەناوچەدا

(1) Roberts, S. H.; The History of French Colonial policy, 1870-1925; London, 1986, pp. 12-14.

پێکهێنا. تەنانەت لە حکوومەتەکانی وەك ئانگور، کاروباری بازرگانی ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەدەگێڕا، پڕۆگرامیان بۆ پێراگەیشتنی زیاتر لە یەك ملیۆن کەس لە حەشیمەتی ئەم وڵاتەیان داڕشت، کە ئەم نیشانەی گۆڕانکارییەکی بەرچاوە لە بواری ئابووری و بازرگانییەوە. مالاکاش، لە سەدەی شانزدەهەمدا پێش ڕووخانی بەدەستی پورتوگاڵ، ناوەندێکی گەورەی ئەنبارکردن لە ئاستی نێونەتەوەیی دابوو، کە لە حاڵی حازردا سەنگاپوور جێگای گرتۆتەوە. پاپۆڕە چینی و ژاپۆنییەکان لە دەریاکانی باشووردا هاتووچۆیان دەکرد و کاروانی گەورەی بازرگانی لە ناوچە وشکانییەکان ببوە سەرچاوەیەکی گەورەی داهات.

داهاتووی گەشی ئابووری ئەورووپاییەکانی بۆ ناوچە پەلکێش کرد. ئەوان دەیانویست سوود لە بازرگانی بەهارات لە ناوچەدا وەرگرن. هەرچەند ئیبرییەکان، پورتوگالییەکان و ئیسپانییەکان، شتێکیان زیاتر لە بەهارات داوا دەکرد، واتە خوازیاری ڕاکێشانی خەڵکی ناوچە بۆ مەسیحییەت بوون، بەڵام لە بیرۆکەی دەستراگەیشتن بە سەروەت و سامان، هەروەها تاڵانکردنی خەڵکی ناوچە غافڵ نەبوون. کاتێك کە ئیسپانیاییەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەم ناوچەیە دەرەتانی کەمی بۆ پەرەپێدانی بەرهەمی هەنار و (صادرات) هەیە، هەستیان بە شکستێکی گەورەکرد.

دوو دەسەڵاتی زلهێزی پورتوگاڵ و هۆڵەندا زیاتر لە وڵاتە زلهێزەکانی دیکە توانیبوویان ئامانجە داگیرکەرەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن و سەرکەوتووبن. ئەم دوو وڵاتە توانییان بازرگانی بەهارات لە تەواوی ناوچەدا، بەتایبەت لە ئەندونیزیا پاوان بکەن و لەژێر چاودێری ئەوان ئەم بەرهەمە دەنێردرا بۆ بازاڕەکانی ئەورووپا. ئەم کردەوە چەوسێنەرانەیە گەیشتبووە ئاستێك کە هەژاری و ڕۆژرەشی خەڵکی ئەندونیزیای لێکەوتەوە و ئاسەواری شوومی ئێستاش هەرماوە. هۆڵەندا کە بەڕواڵەت وەفاداری قەوارەی نەریتی ناوچە بوو و لەم ڕێگایەوە خەڵکی ئەندونزیای یەخسیر کردبوو، پاش ماوەیەك بەهۆی پێشکەوتن لەڕووی ڕێکخراوەیی و تەکنەلۆژیای وڵاتەکەی گۆڕانکارییەکی بەرچاوی لە سیستەمی پێشوودا پێکهێنا. بۆ نموونە هەندێك لە دوورگەکان کە پێکهێنەری سیستەمێکی یەکسانی نەریتی بوون لە بازرگانی کردن بێبەش کران. کە ئاکامەکەی هەژاری خەڵکی ئەو ناوچانە بوو. تەنانەت لەو ناوچانەی کە خەڵکە خۆجێیەکانی دەیانتوانی بازرگانی بکەن، داری بەهاراتیان دەبڕی هەتا نرخەکانی خۆیان لە بازارە نێو نەتەوەییەکاندا بپارێزن[1].

(1) Pluvier, J. M, Southeast Asia from Colonialism to Indepence, Kuala Lumpur, 1964, pp. 150-152.



لەگەڵ ئەمەشدا ئیمتیازی سوود وەرگرتن لە بەرهەمکانی دیکە وەك گوێزی هیندی و قاوە کەوتە ژێر دەسەڵاتی هۆڵەندییەکان و ئەم وڵاتە داگیرکەرە دەستی بەسەر تەواوی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ئەندونزیا داگرت. هۆڵەندییەکان لە ڕێگای دەسەڵاتدارە خۆفرۆشەکان و دەڵاڵە چینییەکان کە نیشتەجێی ئەندونیزیا بوون، پڕۆگرامەکانی خۆان پیادە دەکرد. بەڕواڵەت هۆڵەندا تەنیا چاوەدێربوو، بەڵام هەرکاتێك هۆڵەندییەکان هەستیان بکردبایە کە ناردنی شتوومەکی پێویستی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندا کەوتووەتە مەترسییەوە، خەڵکی گوندەکانی ئەندونیزیایان کە زۆر زیاتر لە ڕابردوو زەحمەتیان دەکێشا، بەڵام سوودەکەی لەچاو پێشوو کەمتر ببوو ناچار دەکرد، گوێڕایەڵی بن (لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی هۆڵەندا ژمارەیەکی زۆر ئیعدامکران و لەم ڕووەوە دەتوانین هۆڵەندان وڵاتی داگیرکەر دابنێین). هۆڵەندا هەروەها لە بەرامبەر ناردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ئەندونیزیا، ئەو وڵاتەی کردبووە بازاڕی ناردنی بەرهەمەکانی خۆی. پاپۆڕە هۆڵەندییەکان بەرهەمە دروستکراوەکانی هۆڵەندایان بەتایبەت بەرهەمی چینییان دەگواستەوە بۆ ناوچە.

لە ئەندونزیا تەنیا ناوچەیەك کە سەرەڕای فشاری هۆڵەندییەکان تووشی قەیران نەهات، دوورگەی جاوە بوو، چونکە ئەم ناوچەیە بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی هۆڵەندییەکاندا بوو و ڕژێمی دەسەڵاتدار تەنیا بەرژەوەندی داگیرکەرانی دەپاراست. خەڵکی ئاسایی نەیاندەتوانی سوود لە سەرچاوەکان وەرگرن و ئەگەر داگیرکەرانیش دەستیان بە هەندێك سەرچاوە ڕانەدەگەیشت نەسیبی بە کرێگیراوە خۆجییەکان کە زۆرتر چینی بوون، دەبوو[1].

سەدەی نۆزدەهەم سەردەمی بە پیشەسازیبوونی ئەورووپا بوو، لە ڕوانگەی هەندێك لە لێکۆڵەران، شۆڕشی پیشەسازی دەستراگەیشتنی بەناوچە داگیرکراوەکانی خێراتر کرد، تاڵان کردنی کەرەستەی خاو ببووە ئامانجی سەرەکی و پڕوگرامێکیان بۆ دابینکردنی گەڵاڵەکرد کە بەپێی ئەم گەڵاڵەیە خەڵکی ناوچەی بێرمە، ڤییتنام یان فیلیپین دەبووایە بێ ئەم لاوئەولا گوێڕایەڵ بن و بە تەواوی لە خزمەتی داگیرکەراندا بوونایە. لەڕوانگەی ڕۆژئاواییەکان ئەم کردەوەیە نەتەنیا ناپەسەند نەبووە، بەڵکو بە مافی بێ ئەم لاو ئەولای خۆیان دەزانی، فەڕەنسا لەسەر ئەو بڕوایە بوو ئەو وڵاتانەی کە وڵاتی دیکەیان داگیر نەکردووە، بەکردەوە مردوون و بۆ گەشەی خۆیان دەبێ دەست بەسەر سەروەت و سامانی وڵاتە داگیرکراوەکاندا بگرن! داگیرکەران

(1) Wertheim, W. F., Indonesian Society in Transition, the Haque, 1959.

سوودوەرگرتنیان لە کانگای قەلاّیی کێڵگەی سروشتی کاۆچۆ، نارگیل و هتد...، بە مافی ڕەوای خۆیان دەزانی، چونکە ئابووری و تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی ئەوروپا و ئەمەریکا پێویستیان بەم بەرهەمانە هەبوو و خەڵکی خۆجێی ئەم ناوچەیەش بەڕواڵەت توانای سوودوەرگرتن لەو سەرچاوانەیان نەبووە. کە دابوو دەستی وڵاتە کۆلۆنیالیزمەکان ئاوەڵا بووە. داگیرکەران بۆ بەرهەمهێنانی و ڕەقی ئاسنی هەرزان بایی، بولّبرینگ و قەلاّیی، مالیزیا و ئەندونزیایان بە تالاّن برد. هەروەها کاۆچۆی سروشتی ئەندونیزیا، مالیزیا و هیند و چینیان بۆ هێنانەدی نیازی کارگەکان بەرهەم هێنەری تایە و پیشەسازی پزیشکی بەردەوام دەردەهێنا.

بە سەرنجدان بەم مەسەلانە لە پێوەندی نێوان دونیای پێشکەوتوو و ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا گەلاڵەیەکی نوێ هاتە ئاراوە و شێوازەکانی پێشووی کۆلۆنیالیزم، وەك بازرگانی بەهارات کە لە پاوانی هۆڵەندییەکاندا بوو، گرینگی خۆی لەدەستدا[1].

بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتری ئەم بابەتە، گرینگی هەندێك لە بەرهەمەکانی ئەم ناوچەیە تاوتوێ دەکەین.

کاوچۆی سروشتی چەندین سەدە پێش ئەوەی کە پێشکەوتنە زانستییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەرەتانی دروستکردنی کەرەستەیەکی قایم و خۆڕاگری لێ پێك بێنێ، ناسرابوو. بەڵام دوای ئەم وەرچەرخانە زانستییە لە ئاستێکی بەربڵاودا کەڵك لەم کەرەستەیە وەرگیرا[2]. پاش ئەم وەرچەرخانە دەبوایە سەرچاوەیەکی زۆر بۆ دابینکردنی ئەم کەرەستە سەرەتاییە بدۆزنەوە. ئەم بەرهەمە تاڕادەیەك لە ئەمەریکای باشوور دەستدەکەوت، بەڵام نرخەکەی زۆر و دۆخی چاندنی لەبارنەبوو.

بەدوای هەوڵەکانی بەرتیانیا بۆ دیتنەوەی ناوچەیەکی لەبار بۆ چاندنی ئەم بەرهەمە، جارێکی دیکە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هاتە بەرباس. دیارە لەبەر ئەوەی گرینگی و بایەخی کاوچۆی سروشتی تا دوو دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم هێشتا هەست پێنەکرابوو، ناتوانین وەك هۆیەك بۆ هاتنی داگیرکەران پێش ئەم قۆناغە دابنێین، بەڵام پاش دۆزینەوەی ئەم بەرهەمە پڕ بایەخەکە لە تەکنەلۆژیای نوێ پێویسیتیان پێ بوو، هاتنی بێگانەکان بۆ سوود وەرگرتن لەم بەرهەمە زیاتر بوو.

(1) Ibid, p.202.
(2) Greetz, C., Agricultural Revdution, Berkeley, California, 1983, p.124.



چەند بەشێکی سەرەکەی لە نیمچە دوورگەی مالایا، جاوە و سوماترا و هەروەها چەندین ناوچە لە ڤییتنام و کامبۆدیا بۆ ئەم بەرهەمە تەرخانکرابوو. پێش لەمە لەناوچە ئاماژەپێکراوەکاندا هیچ کات ئەم بەرهەمە نەچێندراوە. بۆ نموونە پێش ساڵی ١٨٨٠ لە ڕۆژئاوای مالیزیا هیچ کێڵگەیەکی کاوچۆ بوونی نەبوو، لە حاڵێکدا ئێستا زیاتر لە ٦٥ لە سەدی تەواوی خاکی ئەم وڵاتە بۆ چاندنی ئەم بەرهەمە تەرخانکراوە و یەك سێهەمی هێزی کاری ئەم وڵاتە لە کێڵگەکانی کاوچۆدا کاردەکەن. بەم جۆرە ئەو زەوییانەی کە بێ کەڵك یان دارستان بوون، بوونە کێڵگەی نوێ کە پێش قۆناغی کۆلۆنیالیزم کەڵکیان لێ وەرنەدەگیرا[1].

ئەم جۆرە گەلاڵانە کە چاوەڕوان دەکرا لە ماوەیەکی کورتدا سوودێکی باش بەدەست بێنێ، پێویستی بە سەرمایەگوزارییەکی گەورە بوو. ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی کە ملکداری کۆمپانیاکان لە ئەستۆی بیانییەکان یان هەندێك لە خەڵکی خۆجێی بێت ،کە توانای دابینکردنی سەرمایەی پێویستیان هەبوو.

بەم شێوەیە پیشەسازی کاوچۆ سەرەتا لە پاوانی سەرمایەدارە گەورەکاندا بوو و خەڵکی خۆجێی ناوچە زۆر بەرتەسك دەیانتوانی سوودی لێوەرگرن، لەگەڵ ئەمەشدا دەست بەسەر زەوییەکانی خەڵکی گوندەکان گیرا و خاوەن زەوییەکان بوونە کرێکارێك کە ڕۆژانە حەقدەستیان وەردەگرت. لەم ڕێگایەوە فشارێکی زۆر بۆ سەر خەڵك هات و قەوارەی نەریتی کۆمەڵگا گۆڕانکاری بەسەر داهات. بەهۆی بوونی کۆسپ و لەمپەر لەبەردەم هێزی کار لە مالایا، کەسانی بێگانە کە زۆربەیان سریلانکایی و هیندی (خەڵکی باشووری هیندستان وەك ناوچەی مدرس) بوون بۆ کارکردن هێندرابوونە مالایا، چونکە لەو سەردەمەدا کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بەریتانیا لە هیندستان دەسەڵاتی ڕەهای بوو. لە ڤییتنام بەشێوەی گشتی کرێکاری کێڵگەکانی کاوچۆ، خودی ڤییتنامییەکان بوون، بەڵام ئەمە نەتەنیا نەبووە هۆی باشتربوونی بارودۆخەکە، بەڵکو چەرمەسەری ئەوانی زیاتر کرد، چونکە لەکاتی سەرپێچی لە فەرمانی فەڕەنسییە داگیرکەرەکاندا، بەتوندی سزا دەدران (ئەو بەڵگەنامانەی کە دواتر لە پاریس بڵاوبوونەوە و توندوتیژی دەسەڵاتدارانی فەڕەنسی ئاشکراکرد، ڕیسواییەکی گەورەی بۆ ئەم وڵاتە بەدواوە بوو).

(1) Butcher, J. G: The British in Malaya 1880-1914, Kualalumpur, 1979, pp.116-120.

لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەم بەهۆی بەرهەمهێنانی بەربڵاوی کاوچۆ و پێویستی بەو بەرهەمە، کۆمپانیا بچووکە خۆجێییەکان پێیان گرت و توانییان سوود لە فرۆشی بەروبوومەکانی خۆیان وەرگرن. لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ زیاتر لە چل لە سەدی کاوچۆ کە لە مالایا و ئەندونزیا بەرهەم دەهات، پێوەندی بە کۆمپانیا خۆجێیی و بچووکەکانەوە بوو. لە ساڵەکانی کۆتایی دەیەی حەفتای سەدەی بیستەمدا، لە ڕۆژئاوای مالیزیا زیاتر لە ٥٠ لە سەدی بەرهەم تایبەت بوو بە ئیجارەخانە بچووکەکان. گەشەی ئاماژەپێکراو لەگەڵ بەرگری خاوەن کێڵگە گەورەکان (کۆمپانیای گەورەی بازرگانی) بەرەو ڕوو بوو. دیارە ڤییتنام لە بەراورد لەگەڵ مالیزیا و هیندی ڕۆژهەڵات بەهۆی بوونی یاسای تایبەتی و هەڵاواردن و جیاوازی زۆر لە نێوان خاوەن سەرمایە ورد و درشتەکان، بارودۆخێکی خراپتری هەبوو.

### قەلایی

سەدان ساڵ لەمەوپێش، دەرهێنانی قەلای بەشێك بوو لە چالاکیی ئابووری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، واتە پێش ئەوەی کە قەلایی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەهۆی چوونە سەری داخوازی لە ئەمەریکا و ئەوروپا ببێتە کانزایەکی زۆر گرینگ. سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی ناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا خاوەنی ئەم کانزایە بووە، بەڵام مالایا (مالیزیای ئێستا) لەبەرهەمهێنانی بێ هاوتا بووە[1]. پاش سەقامگیربوونی حکوومەتی داگیرکەری بەریتانیا لە دەیەی حەفتای سەدەی نۆزدەهەمدا، دەرهێنانی ئەم کانزا ستراتیژییە لە مالایا دەستیپێکرد و کۆمپانیا گەورەکانی چین کە پێشتر لە ناوچەدا هەڵسووڕانیان بووە، ئەم کارەیان گرتە ئەستۆ. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەوروپاییەکان بە وەگەرخستنی سەرمایەکانیان و وەرچەرخانی تەکنەلۆژیا لەم بوارەدا دەسەڵاتی چینییەکانیان لە دەرهێنانی قەلایی خستە مەترسییەوە، چونکە بەهۆی بایەخی لە رادەبەدەری ئەم کانزایە، ئەوروپاییەکان کەوتنە بیری ئەوەی کە بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. سەرەڕای ئەمە بەهۆی پێویستی لە رادەبەدەری ئەم پیشەسازییە کە بە کرێکاری زۆر نەیانتوانی بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی چینییەکان بیهێننە دەرەوە.

(1) Winstedt, R. O, Government and Politics of Southeast Asia, 2nd. Ed, Ithaca, N. Y. 1989. p.94.



لەگەڵ ئەوەی کە سوودوەرگرتن لە کاوچۆی سروشتی و پیشەسازی پێوەندیدار بەو بەرهەمە لە پاوانی ئەوروپاییەکان و کۆچبەرە چینییەکاندا بوو، کەڵکیان لە قەلایی خەڵکی خۆجێیی مالایاش وەردەگرت. ئەوان هەتا ماوەیەکی زۆر لەو بوارەدا هەڵسووڕانیان بووە تا ئەوەی کە هێرشی بەریتانیا کۆتایی بەم بارودۆخە هێنا و سوودوەرگرتن لەم سەرچاوە سروشتییەش بەتەواوی کەوتە دەستی داگیرکەران و خاوەنە سەرەکییەکانی، واتە خەڵکی مالی لێی بە بەشکران.

### برنج:

کۆکردنەوەی کاوچۆی سروشتی زۆر پشتی بەهێزی کرێکار دەبەست و پیشەسازیی قەلاییش لەبەردەستی گرووپە بیانییەکاندا بوو، بەڵام لە بەرهەمهێنانی گرینگترین بەروبوومی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا واتە برنج، گوندنشینە خۆجێیەکانی ناوچە ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبووە.

پێش هێرشی ڕۆژئاوا، ماوەیەکی دووروودرێژ برنجی ئەم ناوچەیە دەنێردرایە دەرەوە، هەرچەندە کە ڕێژەی ناردنی بەرتەسك و بەرهەمهێنانی پەرش و بڵاو و بەشێوەی نازانستیانە بوو کۆکردنەوەی ئەم بەرهەمە لە پەلی یەکەمدا بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییە نێوخۆییەکان بوو، هەربۆیە بەرهەمەکان لە ئاستی دابینکردنی پێویستی بنەماڵەکاندا بوو. هەندێك جاریش، بارودۆخی لەباری ئاو و هەوایی دەبووە هۆی چوونە سەری ڕێژەی ئەم بەرهەمە، زیادییەکەی دەنێردرایە دەرەوەی ناوچە[1].

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا پێکهێنانی بازاڕە نێونەتەوەییەکان بۆ ناردنی بەرهەمی برنج بووە ئەنگیزەیەك بۆ پەرەپێدانی کێڵگەی برنج لەو ناوچانە، هەروەها بردنە سەری ڕێژەی بەرهەمەکە. زارکی چوومەکانی مەکونگ لە ڤییتنامی باشوور، چاوفرایا[2] لە تایلەند و ئیراوادی[3] لە بێرمە ناوچەگەلی لەباربوون کە کۆکردنەوەی بەرهەم لەواندا دەستیپێکرد. لە ڤییتنام و بێرمە پەرەپێدانی ئەم بەرهەمە لە ئەستۆی ڕژێمی کۆلۆنیالیزمی

(1) Vietnam and the Chinese Modd, p.223.
(2) Chaophraya.
(3) Irrawaddy.

فەڕەنسا و بەریتانیا بوو، بەڵام لە تایلەند تاڕادەیەك بەشێوەی سەربەخۆ و بەدەستی خودی خەڵکی ناوچە بەڕێوەدەچوو.

چوونەسەری بەرهەمی برنج، وەك پەرەپێدانی کێڵگەکانی کاوچۆی سروشتی لە مالایا، بووە هۆی گۆڕینی جوگرافیای ناوچەکە. بەرهەمی برنج لە زارکی چۆمەکانی ئاماژە پێکراو لە بێرمە، تایلەند و ڤییتنام سەد یا سەد و بیستساڵ لەمەوپێش لە ئاستێکی زۆر بەرتەسکدا بووە. لە ڕاستیدا ئەمانە ناوچەگەلێك بوون کە کۆنترۆڵ نەدەکران، بەڵام ئەمڕۆ بوونەتە ناوچەیەکی یەکجار دەوڵەمەند. ئەم گۆڕانکارییە لە ئاکامی تێکۆشانێك وەك وشککردنی مرداوەکان، دروستکردنی گەرووەکان و چەندین شێوازی تەکنەلۆژیا و دیارە بە چەوسانەوەی چەند ملیۆن مرۆڤ پێکهات.

بەرهەمی برنج لە ئاستێکی بەربڵاودا، لەسەرەتادا ئەم هیوایەی دروستکرد کە هەلێکی زێڕین بەدەست هاتووە کە تەنانەت وەرزێرە کەمداهاتەکانیش سوودی لێوەربگرن و بۆ یەکەم جار لە ناوچەدا ئەو بەربەستانەی کە لەبەردەم وەرزیران دابوو، تێکچوو. بەڵام پێویستی بەسەرمایەی گەورە ئەم هیوایەی تووشی ناهومێدی کرد، بۆ دابینکردنی تۆو و پێداویستییەکانی دیکە، هەروەها دامەزرانی کرێکار بۆ ئەوەی لە کورتترین ماوەدا بەرهەم کۆبکرێتەوە، پێویستی بە سەرمایەی گەورەبوو. خاوەن کێڵگەکانی برنج لە بێرمە و ڤییتنام ئەگەر خاوەن سەرمایە بوونایە دەیانتوانی چالاکتر بن و لەو بوارەدا کێبەڕکێ بکەن، بەڵام لە زۆر حاڵەتدا توانای ئەم کارەیان نەبوو[1].

خەڵکی گوندەکان زۆر زوو بۆیان دەرکەوت، کە ناتوانن لە پەرەپێدانی ئەم بەرهەمەدا ڕۆڵیان هەبێ. هەربۆیە ڕازی بوون بەوەی کە کێڵگەکانیان بە ئیجارە بدەن و بەهۆی نەبوونی دەرەقانی ماڵی دەبوونە کرێکاری سادە. دیارە هیوا و ئاواتی فەڕەنسییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی بەرهەمهێنانی برنج لە ڤییتنامی باشووریش بووە بلقی سەر ئاو، چونکە ئەو کەسانەی کە بەشێوەی سەرەکی کەڵکیان لێ وەردەگرت ژمارەیەکی کەم لە دەوڵەمەندەکانی ڤییتنامی، بازرگانە گەورەکانی چینی و ئەنباردارانی شاری چولون[2] (خوشکی شاری سایگون[3]، هۆشی مینی ئێستا) بوون. دەوڵەمەندەکانی ڤییتنام، کە بەرژەوەندییان لەگەڵ بەرژەوەندی حکوومەتی

(1) Vietnam and the West, p.66.
(2) Cholon City.
(3) Saigon City.



کۆلۆنیالیزمی فەڕەنسا یەکی دەگرتەوە، توانای دابینکردنی سەرمایە و کرێکاری پێویستیان بۆ گۆڕینی ناوچەیەکی بێ بەرهەم بەناوچەیەکی پڕ پیت و بەرەکت بوو. بازرگان و ئەنباردار، چینییەکان کە کۆنترۆڵی ئاشە گرینگەکانی ((چولون)) یان لە ئەستۆ بوو، ڕایەلکەیەکیان پێکهینا بوو کە هیچ کەس، نە ئەوروپاییەکان و نە ڤییتنامییەکان، نەیانتوانی نفووزی تێبکەن یان زیانێکی پێبگەیەنن.

لە بێرمە بارودۆخەکە جیاواز بوو، چونکە بێرمە بە شێوەی ڕاستەوخۆ پێوەندی بە هیندستانەوە هەبوو، کە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بووە و کۆنترۆڵی بێرمە لەلایەن بەریتانیاوە وەك پەرەسەندنی دەسەڵاتی بەریتانیا لە هیندستان هەڵدەسەنگێندرا. لە ئاکامدا، کۆچی بێ سنووری هیندییەکان لە هیندستان بۆ بێرمە شتێکی سروشتی بوو و لە ماوەیەکی کورتدا ژمارەیەکی زۆر لە هیندییەکان هاتنە ئەم وڵاتە و ڕۆڵێکی سەرەکییان لە پەرەسەندنی بەرهەمهێنانی برنجدا گێڕا. ئەو هیندییانەی کە دەوڵەمەندبوون، قەرزیان بە خەڵکی گوندەکان دەدا و بەرەبەرە کرێکارانی هیندی کاریان پێ دەسپێردراو دەبوونە هۆی ئەوەی کە خەڵکی هەژاری بێرمە تەنانەت لە کرێکاریش بێ بەشبکرێن (دوژمنایەتی بێرمەییەکان لەگەڵ هیندییەکان زیاتر لێرەوە سەرچاوە دەگرێ و دەرکردنی موسڵمانەکانی ڕوهینگیا بۆ بەنگلادیشی لێکەوتەوە، لەم دواییانەدا دەوڵەتی ڕانگون ڕایگەیاندبوو، کە هیندییەکان-موسڵمان و غەیرە موسڵمان- هاوکات لەگەڵ داگیرکەراندا کۆچیان کردووە و لە ڕوانگەی یاساییەوە وەك هاووڵاتی حەسێبیان بۆ ناکرێ و مڵك و دارایەکانیان هی دەوڵەتە و دەبێ دەستی بەسەردا بگیرێ)[1].

وەرچەرخانی گەورەی ئابووری بەهۆی بەرهەمهێنانی برنج بووەتە هۆی ئەوەی کە ئابووری ڤییتنام و بێرمە ببەسترێتەوە بە بازاڕی نێونەتەوەیی برنجەوە. لەم ڕووەوە لە دەیەی ١٩٣٠، واتە ساڵەکانی داکشانی جیهانی، ئابووری ئەم دوو وڵاتەش بەتووندی زیانی پێگەیشت و قەیرانێکی گەورەی خوڵقاند و ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارانی بێرمەیی و وەرزێرە هەژارەکان کە لە ماڵی خۆیان وەدەرنرابوون و ڕێگای کرێکارییان گرتبووەبەر بێکار کران. کاریگەریی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەم قەیرانە ئابوورییە ئەوەندە زۆر بوو کە بووە هۆی خۆپێشاندان و شۆڕش لە بێرمە و تا ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا.

(1) Adas, M., the burma Delta: Economic Development and Social Change on an Asian Rice Frontier, 1852-1941: London, p. 156.

گەشەی بەرهەمهێنانی برنج لە تایلەندیش گۆڕانکاری پێکهێنا ئەگەر بڵێین کە لە تایلەند تەنانەت گوندێکیش لەو گۆڕانکارییە کە ئاماژەمان پێکرد زیانی پێنەگەیشت بە هەڵەدا نەچووین، چونکە لەبەراورد لەگەڵ دوو وڵاتی ڤییتنام و بێرمە زەرەر و زیانەکە زۆر کەم بووە. لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا لە تایلەند ناوچەیەکی یەکجار بەربڵاو بۆ چاندنی برنج لەبەردەستی وەرزێڕاندا بووە، دیارە لەمپەریش هەبووە، چونکە پێویستی بە سەرمایەی گەورە، بەکردەوە توانایی خەڵکی ئاسایی بەرتەسك دەکردەوە. لەبەر ئەم هۆیە بوو کە بازرگانی برنج و خاوەن ئاشەکانی برنج کە زۆربەیان چینی بوون لە گۆڕانکاری نوێدا ڕۆڵی سەرەکییان گێڕا.

### کاڵاکانی دیکە کە دەنێردرانە دەرەوە

کاوچۆی سروشتی، قەلایی و برنج گرینگترین بەرهەمی هەناردەی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیایە و بەرهەمی دیکەش لە ناوچەدا هەبوون کە بەهۆی پێویستی بەسەرمایە و کرێکاری زۆر سوودیان لێ وەرنەدەگیرا. لە ناوکی نارگیل لە ئاستێکی خوارتر لە کاوچۆ، سوودی لێوەردەگیرا هەروەها توتن، قاوە، لە هەمووی گرینگتر شەکەریش جێگای سەرنج بوو. بەرهەمی شەکەر لە جاوە و فیلیپین لە چالاکیی خەڵکی ئەم دوو ناوچەیەدا ڕۆڵی سەرەکی گێڕاوە و وەك بەرهەمی هەناردەی سەیری کراوە. چاندن و کۆکردنەوەی شەکەر بەهۆی پێویستی بە کرێکاری هەرزان، لە گۆڕینی وەرزێڕی کەمداهات کە تەنیا بژێوی خۆی دابیندەکرد بۆ کرێکاری مووچەخۆر ڕۆڵی سەرەکی گێڕاو لە کۆتاییدا بووە هۆی وەرچەرخانی سیستەمی نەریتی و گۆڕانکاری گەورەی ئابووری لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمی پێکهێنا. پەرەسەندنی پیشەسازی نەوتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە پێویستی بە کرێکاری کەم و سەرمایەیەکی یەکجار زۆر هەبوو، یەکەمین جار لە دەیەی هەشتای سەدەی نۆزدەهەمدا لە بێرمە هاتە بەرباس. لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بەرهەمی نەوت وەك کالایەکی دەرچوو، لە دوورگەی سوماترا لە ئەندونزیا و لە ناوچەکانی سارآواك و برۆنی لە باکووری دوورگەی برنئۆ دەستیپێکرد.

هاوڕێ لەگەڵ وەرچەرخانە ئابوورییەکان، گۆڕانکاری لە بوارەکانی دیکەدا هاتنە ئاراوە، لەوانە گۆڕانکاری لە پێکهاتەی کۆمەڵگا، کۆچی گوندنشینەکان بۆ شارەکان، گەشەی حەشیمەت لە وڵاتانی ناوچە (وەك جاوە کە لەگەڵ تەقینەوەی حەشیمەت بەرەو ڕوویە) دامەزرانی ماڵیاتی نوێ و پێکهێنانی بونیادە تازە دامەزراوەکان لە گوندەکاندا (جێگایەك کە پێشتر بونیادی



لێنەبووە). بۆینە فەڕەنسییەکان لە کامبۆدیا گۆڕانکارییەکی گەورەیان پێکهێنا بەشێوەیەك کە لە ساڵەکانی ١٩١٥ و ١٩١٦ لەم وڵاتە لە پەراوێز کەوتوو و نەریتییەدا، بزووتنەوەیەکی ئیعترازی ڕوویدا، کە هەندێك جار هەتا سەد هەزار بەشدار دەبوون، هۆی سەرەکی ئەم بزووتنەوانە هەژاری خەڵك بوو.

دروستبوونی شارەکان و ناوەندە گەورەکانی بازرگانی (وەك سەنگاپوور) کە پاش کردنەوەی گەرووی سوئیز لە ساڵی ١٨٦٩ گەشەی زیاتری بەخۆوە بینی، ئاکامی ئاڵوگۆڕ و وەچەرخانی ئابووری بوو. هەتا کۆتایی دەیەی نەوەدی سەدەی نۆزدەهەم زۆربەی هاتووچووەکان لە مالایا لە ڕێگای چۆمەکانەوە بوو، بەڵام ئەو گۆڕانکارییانە کە لە ئاکامی هێرشی ڕۆژئاوا و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەکانی مالایا هاتنە ئاراوە، بووە هۆی ئەوەی کە سیستەمی ڕێگاوبان لەم وڵاتە دابمەزرێ و هێڵەکانی ڕێگای ئاسن دروست بکرێن. بەهەر حاڵ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە ماوەی کەمتر لە ساڵێك بووە وڵاتێك کە کاڵا بنێرێتە دەرەوە و هەتا دەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی کۆمەڵێك گۆڕانکاری ڕوویدا کە بێ وێنە بوو.

# فەسڵی حەوتەم

## کۆچبەری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا

هەر کەسێکی بیانی کە سەفەری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بکردایە لەگەڵ فرەجۆرییەکی بەرچاو لەڕووی ڕەگەزی و ڕەنگی پیت بەرەو ڕوو دەبوو. تێکەڵاوی ڕەگەزەکان لە شارێك بۆ شارێکی دیکە جیاواز بوون. سیمای پاشماوەی کۆچبەرە ڕەش پێستەکانی تامیل، کە لە باشووری هیندەوە هاتبوون، لەگەڵ پاشماوەی کۆچبەرە چینییەکان یان کۆچبەری ناوچەکانی باکووری هیندستان بەتەواوی جیاوازن[١]. هەندێك جار، جۆری جل و بەرگ زیاتر لە سیماکانی جیاوازییەکان دەردەخەن. هەروەها بوونی مزگەوت و پەرستگەی هیندی، چینی و کلێسای مەسیحی نیشاندەری ئەم جیاوازییانەیە. مەبەست لەکۆچبەر کەسانێکن کە لە وڵاتی بێگانە نیشتەجێن و ژیانێکی نوێیان لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەیە دەبێ بزانین کە ئەم گرووپە سەرەڕای ئەوەی، کە چەندین نەوە لەم ناوچەیەدا دەژین، بەڵام هێشتا وەك بەشێك لە کۆمەڵگا وەرنەگیراون و زیاتر لە دەرەوەی کۆمەڵگای ئاماژەپێکراو چالاکیی کۆمەڵایەتی خۆیان بەڕێوەدەبەن. بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە بارودۆخی کۆچبەرە چینییەکان بکەین، هەر ئێستا، لە کۆتایی سەدەی بیستەم زۆربەی ئەو چینییانەی کە لە نیمچە دوورگەی مالیزیا دەژین پاش تێپەڕینی سەد ساڵ (لانیکەم سێ نەوە) نیشتەجێ بوون، لەم وڵاتەدا هێشتا بە تەواوی تێکەڵی ئەم کۆمەڵگایە نەبوون. لە دەیەی ١٩٣٠ چینییەکانی نیشتەجێی مالایا وەك تابووری

(1) Sandhu, K. S., Indians in Malaya: Immigration and Settlement, 1786-1857, Cambridge, 1969, pp. 60-63.



پێنجەمی چین و کارگێڕانی ناوچەی چینی گەورە دەناسران[١]. بارودۆخی کۆچبەرانی هیندیش لەم ناوچەیە کەم تا زۆر بەم شێوەیە بوو.

زۆربەی کۆچبەرانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە چین و هیندستانەوە دەهاتنە ئەم ناوچەیە و چوونە سەری ڕێژەی کۆچبەرانی ئەم دوو ڕەگەزە وەرچەرخانێکی تاڕادەیەك نوێ بوو کە دەگەڕایەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم. زۆربەی ئەم کەسانە لە شارەکان نیشتەجێ بوون یان پیشەیەکان هەڵبژارد کە لەگەڵ ناوەندە بازرگانییەکان لە شارەکان لە پێوەندیدا بووە[٢]. دیارە پێشینەی کۆچبەری بۆ ئەم ناوچەیە بە قەدەر کۆنی مێژووەکەیەتی، پێش زایینی مەسیح شەپۆلێك لە کۆچبەران هاتنە ئەم ناوچەیە وپێش نشتەجێ بوونی خێمێر لە کامبۆدیای ئێستا، لەوێ سەقامگیربوون. لەم کۆچ کردنانەدا هاتنی فەرهەنگێك زیاتر گرینگی پێدەدرا، هەتا نیشتەجێ بوونی ڕەگەزێکی نوێ. سەبارەت بە ناوچە ئاوی-خاکییەکانیش بەڵگەکان دەری دەخەن کە کۆچ کردن بۆ ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغەکانی پێش زایین. دیارە کۆچکردن لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ دەرەوە لە مێژووی ناوچەدا بووە، هەروەك چۆن کاریگەریی فەرهەنگی ئەندونزیا لەناوچە دوورکەوتووەکانی وەك ماداگاسکار[٣] (لە ئەفریقا) دەبینرێ.

بەپێی بەڵگەنامەکان، کۆچکردن بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەموو کاتێك دڵخوازانە نەبووە. ژمارەیەکی کەم لە هیندییەکان کە بۆ ناوچە کۆچیان کردبوو ڕۆڵی گرینگیان گێڕاوە. لە سەردەمی کۆندا کۆچبەرە چینیەکان بەرەبەرە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نیشتەجێ بوون و دەستیان دایە بازرگانی کردن، ئەوان لە هەندێك ناوچەدا وەك کامبۆدیا لەگەڵ خەڵکی خۆجێی ژیانی هاوبەشیان پێك هێناوە و پاش تێپەڕبوونی دوو نەوە، چیدیکە وەك ڕەگەزێکی بێگانە سەیریان نەدەکردن[٤].

(1) Roff, W. R., the origins of Malay Nationalism, New Haven, Conn. 1967, p.40.
(2) Indians in Malaya: Immigration and Settlement, p.70.
(3) Madagadcar.
(4) Lebar, F, Ethnic Groups of Insular Southeast Asia, 2 vols, New Haven, Coon, 1975.

هێرشی نەژادی تایی بۆ ناوچەی ئێستای لاوس و تایلەند کۆچێکی بەربڵاوبوو کە لە کۆتایی قۆناغی کۆندا روویدا. سەبارەت بە چۆنیەتی ئەم کۆچە حەرەکەتێکی بە کۆمەڵ و زۆرەملێ بووە یان دڵخوازانە کە بووەتە هۆی پەرەپێدانی فەرهەنگی و زمانی تایی.

خەڵکی ڤییتنام پاش سەربەخۆیی و رزگاربوونیان لەژێر دەسەڵاتی چین لە ساڵی ٩٣٩ی زایینی درێژەیان بە کۆچی بەرەبەرە، بەڵام بەردەوامی خۆیان بۆ داگیرکرد. پێشڕەوی ڤییتنامییەکان بۆ لای باشوور کە ناوی ((نام-تین))[1] یان لەسەر دانەبوو، تا کاتی هاتنی فەڕەنسا بۆ ناوچە لە سەدەی شازدەهەم هێشتا بەردەوام بوو. لە ناوچەکانی دیکەدا، کۆچکردن بەشێوەیەك بوو کە مێژوونووسی ناوداری چین، چوتاکوان، نووسیویەتی، واتە نیشتەجێ بوون لە ناوچەیەکی نوێ بەستراوەتەوە بە گۆڕانکارییە جۆراوجۆرەکان. لە هەندێك لە کۆچەکان تاکەکان بە خێرایی تێکەڵی کۆمەڵگا دەبوون، بەڵام لە هەندێکی دیکە، کۆچبەران بەشێوەیەکی جیاواز لە کۆمەڵگا دەمانەوە، بۆ وێنە لە سەدەی پازدەهەم واتە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی مالاکا کە کۆمەڵگای چینی، عەرەب، هیندی، ئەندونیزیایی و ئێرانی کە بۆ گەورەیی و شکۆی ئەو شوێنە یارمەتی یەکتریان دەکرد، سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵ و هاوکارییە بە کۆمەڵە کە پێکەوە هەیانبوو، ئەم شارەیان وەك شوێنی ژیانی هەتا هەتایی خۆیان هەڵبژارد و بەردەوام بیریان لە نیشتمانی سەرەکی دەکردەوە. ئەم بارودۆخە لە زۆربەی ناوچەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیادا بووە و تەنیا لەم ساڵانەی دواییدا کۆچبەرانی ئەم ناوچەیە ویستوویانە بەشێوەی بەردەوام بمێننەوە. هەندێ: لە کۆچبەران لە ناوچەدا، خاوەن پلەوپایەن و بنەماڵە و کەسوکاریان لەگەڵ نەژادی دەسەڵاتدار تێکەڵاو بوون و فەرهەنگی نوێیان وەرگرتووە. دەتوانین وێنەگەلێکی ئەوتۆ لە تایلەند ببینن، لە سەدەی حەڤدەهەمدا بنەماڵەیەکی ئێرانی بە سەرپەرشتی شێخ ئەحمەدی قومی، لە بازرگانەکانی قوم، سەفەری تایلەندی کردووە. شێخ ئەحمەد بەهۆی سەرکەوتنی لە بازرگانیدا بە ((رئيس التجار)) ناوزەد کراوە و پاشان بووەتە سەرۆك وەزیرانی وڵاتی تایلەند. ئەم بنەماڵەیە کە سەرەتا لە شاری ئەیۆدیا[2] بوون پاش دوو سەدە بوونە بنەماڵەیەکی گەورە و خاوەن دەسەڵات لە کۆشکی پاشایەتی تایلەنددا[3]. شێخ

(1) Nam-Tien.
(2) Ayuthia.

(٣) فاروقی عباس، سفینه سلیمانی، ص٢٧٩-٢٨١.



ئەحمەدی قومی لە تایلەند پەرەی بە مەزهەبی شیعەدا و هەتا لە ژیاندا بوو وەك شیعەی ((اثنی عشر)) مایەوە، بەڵام نەوەکانی روویان لە ئایینی بوودا کرد و ئێستاش وەك یەکێك لە بنەما لە گەورەکانی تایلەند سەیریان دەکرێ. دوو کەس لە نەوەکانی ناوبراو لە نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٧٠ پلەی سەرۆك وەزیرییان وەدەست هێنا، دەورەی سەرۆکایەتی ئەم دووە لە مێژوویی نوێی تایلەند وەك قۆناغی شۆڕشگێڕی ناسراوە و بە کردەوە لەگەڵ قۆناغە دواکەوتووەکان لە تایلەند جیاوازی هەبووە. کۆچبەری دیکەش هەبوون کە نەیانتوانی خۆیان لەگەڵ بارودۆخی نوێ رێکبخەن. لەم بارەیەوە دەتوانین ئاماژە بە هەندێك لە بنەماڵە چینییەکان بکەین کە چوونەتە مالایا. نەوەکانی ئەم بنەماڵانە هیچ کات نەیانتوانی نە بەتەواوی تێکەڵی فەرهەنگی نوێ بن و نە ئەوەی کەسایەتی چینی خۆیان بپارێزن، ئەوان لە حاڵێکدا خۆیان بە دانیشتووی مالایا دەزانی، نە چینی بوون و نە مالایایی. بە پێچەوانەوە، چینییەکانی مێستیزۆ[1] (چینییە دوورگەکان) لە فیلیپین بە تایبەت لە مانیل گرووپێك بوون کە لە کۆمەڵگا وەرگیران و بەتەواوی تێکەڵی سەرزەوی بێگانە بوون. لە سەدەی هەژدەهەمدا چینییەکانی مێشتیزۆ لە فیلیپین تێکەڵی رەگەزەکانی دیکە بوون و رۆڵی سەرەکییان لە گۆڕانکارییەکانی دوایی ئەم وڵاتەدا گێڕا و هەر ئێستاش رۆڵی گرینگیان لەم وڵاتەدا هەیە. بێجگە لەو خاڵانەی ئاماژەی پێکرا، بارودۆخی کۆچبەران لە تەواوی ناوچەدا وەك یەك بووە. لە شارەکانی لێواری دەریاکان و شارە گەورەکان چەندین گرووپی بچووکی کۆچبەران کارگەلێکیان پێ ئەسپێردراوە، کە خەڵکی خۆجێیی لە ئەنجامدانی خۆدەبوێرن. لە نێوان کۆچبەراندا، چینییەکان رۆڵی زیاتریان هەیە. لایەنی چالاکیی بازرگانی و ماڵی ئەوان زۆر بەربڵاوە. لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا ژمارەی چینییەکان لە شاری باتاویا (جاکارتای ئێستا) و ناوچەکانی دەووروبەر نزیکەی ٢٢ هەزار کەس بوون. ژمارەی ئەوان لە مانیلیش یەکجار زۆر بوون، بەڵام لە دەرەوەی ئەم دوو ناوچەیە ژمارەیان زۆر کەم بووە.

گۆڕانکارییەکانی سەدەی نۆزدەهەم چەندین هۆکاری هەبوون. لە هیچ ناوچەیەکدا کاریگەری کۆچبەرانی ئاسیایی بە ئەندازەی کارویگەری ئەوان لە مالایا و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا (پنانگ، مالاکا و سەنگاپوور) بەرچاو نەبوو. ئەم کۆچکردنانە بەتایبەت

(1) Chinese Mestizo.

لە سەنگاپوور گۆڕانکارییەکی زۆر لە پێکهاتەی حەشیمەتی و سیاسیدا پێکهێنا. کاتێك کە تۆماس رفلز[1] لە ١٨٩١ سەنگاپووری وەك بەشێك لە ناوچەی پاشایەتی بەریتانیا راگەیاند، بووە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی کەم لە ماسیگرەکان و دزە دەریاییەکان کە لە سەنگاپوور لە هاتوچۆدا بوون، بڵاوەی پێ بکەن. رفلز پاش ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێك لە لایەنەکانی پێوەندیدار بە کێشەی مەسەلەی بریکاری شانشنی جوهور، سەنگاپووری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. تێکۆشانی ناوبراو بۆ گۆڕینی سەنگاپوور بە ناوەندی بازرگانی نێونەتەوەیی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا زۆر بەرچاو بوو. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو مەبەستانەی ئاماژەی پێکرا، پێویستی بەهێزێکی گەورەی ئینسانی بوو. چونکە ئەو کەسانە کە پێشتر لە ناوچەدا هاتووچۆیان دەکرد یان بەشێوەی کاتی نیشتەجێ بوون بۆ گۆڕینی سەنگاپوور بە سیستەمێکی ئەنبارداری، نەیانتوانی وڵامدەری ئەو دۆخە بن. هەر بۆیە لە قۆناغی یەکەمدا، چینییەکان، پاشان هیندییەکان بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنران. ئەم قۆناغە گۆڕانی بێ وێنەی ژمارە و ئاماری حەشیمەتی سەنگاپوور نیشاندەدا. پێنج ساڵ پاش دامەزرانی ناوچەی نوێی سەنگاپوور حەشیمەتی ئەم دوورگەیە شەش سەد کیلۆ مەترییە هەتا زیاتر لە دە هەزار کەس چووەسەر. حەشیمەتی ((مالی))یش زیادیکرد بە جۆرێك کە ژمارەیان گەیشتە چوار هەزار و پێنج سەد کەس کە لەچاو ساڵی ١٨١٩، ٤٠ لە سەد حەشیمەتی زیادی کردووە[2]. دیارە چینییەکان زۆربەی ئەم حەشیمەتەیان پێکهێناوە. لە ناوەڕاستی دەیەی چلی سەدەی نۆزدەهەمدا ژمارەی چینییەکان لەچاو خەڵکی مالی چووە سەرێ. لە حەشیمەتی ٥٢ هەزار کەسی خەڵکی سەنگاپوور زیاتر لە ٣٢ هەزار کەس، واتە ٦١ لە سەدی خەڵکی سەنگاپوور چینییەکان بوون. چینییەکان تەواوی کارو پیشەی ناوچە، هەروەها لە ماوەیەکی کورتدا کۆنترۆڵی ئابوورییان بەدەستەوە گرت و تەنانەت لە ئەوروپاییەکانیش دەوڵەمەندتر بوون.

لە ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش چینییەکان ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە. لە نیمچە دوورگەی مالایا ژمارەی چینییەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا

(1) Thomas Rafles.
(2) Turnbull, C. M. A History of Singapore, 1819-1975, Kuala Lumpur, pp.172-173.



بەردەوام زیادیکرد. ئەم زیادبوونە لە قۆناغی جەنگی دووەمی جیهانی زۆر بەرچاو بوو و لەڕووی سیاسییەوە کێشەی زۆری خوڵقاند، کە هێشتا ئاسەواری هەر ماوە[1].

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا بارودۆخی سیاسی مالیزیا و سەنگاپوور لەگەڵ دۆخی ئێستایان جیاوازی هەبوو. بەریتانیا لە سێ ناوچەی پنانگ، مالاکاو سەنگاپوور دەسەڵاتی ئیداری و سیاسی بوو، بەڵام ناوچەیەك کەدواتر بە مالایای بەریتانیا ناسرا، لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا هاتە دەرەوە. سەرکەوتنی بەریتانیا بۆ پێکهێنانی گۆڕانکاری لە سەنگاپوور و کەڵکوەرگرتن لەم بارودۆخە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی کە بەریتانیا هۆگرییکی ئەوتۆ بۆ پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەکانی نیمچە دوورگەی مالایا کە بەردەوام دەسەڵاتدارانی لەشەڕ و کێشەدا بوون، لەخۆی نیشان نەدا.

شانشینی جوهور، کە تەنیا یەك کیلۆمەتر رووبارێك کە قووڵ نەبوو، لە سەنگاپووری جیادەکردەوە، یەکەمین حکوومەتی مالی بوو کە پێوەندیەکی بەربڵاوی لەگەڵ سەنگاپوور دامەزراند. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، جوهور لەڕووی ئابوورییەوە بە سەنگاپوور بەسترا بوو. چەندین سەدەی خایاند هەتا جوهور ببێتە بەرهەمهێنەری سەرەکی ئاوی شیرین و پێداویستییەکانی دیکە ناوچە (ئێستا سەنگاپوور بۆ دابینکردنی ئاوی شیرین بەستراوە بە مالیزیا). چینییەکانی نیشتەجێی جوهور لەگەڵ خەڵکی سەنگاپوور لە سەرەتاوە، پێوەندییەکی پتەویان پێکهێنا بوو. ئەم کارە لە پەرەپێدانی کشتوکاڵ لە جوهور، وەك دابینکەری خواردەمەنی سەنگاپوور، ڕۆڵی کاریگەری بووە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم جوهور بووە ناوچەیەکی سەرەکی چاندنی گیاکانی هیندی و بیبەر و ئامادەکردنی رەنگ.

بەڵام لەگەڵ هەمووی ئەمانەدا، کشتوکاڵی چینییەکان لە جوهور لەچاو پیشەسازییەکانی دیکەی مالایا، کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەشێوەی بێ وێنە پەرەی ئەستاندبوو، پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینیبوو. پاش ساڵی ١٨٥٠، چوونە سەری خێرای دەرهێنانی قەلایی بووە هۆی ئەوەی کە هێزی کاری چینییەکان، هەروەها سەرمایەکانی ئەوان گرینگییەکی تایبەتی پەیدا بکا. دەرهێنانی قەلایی لە سەدەکانی پێشوو لە ناوچەی مالایادا

(1) Wang, Gungwu, Commanity and Nation, Essays on Southeast Asia and the Chinese, Sydney, 1981, p.90.

بەڕێوەچوو، بەڵام بەشێوەی سەرەتایی. هاوکات لەگەڵ گۆڕانکارییە بەرچاوەکانی ڕۆژئاوا و سەرەتای قۆناغی پیشەسازی، داواکاری بۆ ئەم کانزایە رووی لە زیاد بوون کرد و بووە هۆی ئەوەی کە شێوازی کۆنی دەرهێنانی قەلایی گۆڕانی بەسەردابێ. بوونی سەرچاوەی دەوڵەمەند لە مالایا و پێویستی زۆر بەم کانزایە، لە چین کرێکاری هێنا. لەو سەردەمەدا بەهۆی سیاسەتی کۆلۆنیالیستی لە چین، بەتایبەت سیاسەتی بەریتانیا دوای شەڕی یەکەمی تریاك (١٨٣٩-١٨٤٢)، بارودۆخی ژیانی چینییەکان لەوپەڕی خراپیدا بوو، هەر بۆیە چینییەکان ناچاربوون بۆ دابینکردنی بژێوی ڕۆژانەیان روو لە بەندەرە قەرارداربیەکان بکەن[١]. ئەمە دەرەتانێکی باش بوو بۆ بەریتانیا کە دەسەڵاتی بەسەر هەندێك لە بەندەرەکان وەك کواندونگ (کانتون) هەبوو، هەتا لەو ڕێگایەوە کرێکارانی ئەو بەندەرانە بۆ مالایا ڕاگوێزێ. گەورە پیاوان و سەرۆکی ناوچە جۆراوجۆرەکانی مالایاش، کە بایەخی کرێکارە چینییەکانیان بۆ دەرکەوتبوو، بەشێوەی ڕاستەوخۆ لە ڕێگای نوێنەرانی خۆیان لە سەنگاپوور کاریان پێ ئەسپاردن. لە دەیەی شەستی سەدەی نۆزدەهەمدا بە چوونەسەری داواکاری بۆ قەلایی، ژمارەی کرێکارە چینییەکان کە لە کانگاکاندا کاریاندەکرد، هەروەها بازرگانی و دەڵاڵە چینییەکان، زیادیکرد. بەهۆی ماندووبوون و زەحمەتی دەرهێنانی قەلایی، گوندنشینە مالاییەکان ئوگرییەکیان بۆ ئەم پیشەیە نیشان نەدەدا. دیارە ئەم کارە، بێ کێشە نەبوو. چونکە کرێکارانی کانگا کە لە چینەوە هاتبوون وەك نیشتەجێبووانی هەتا هەتایی مالایا چاویان لێنەدەکرا و بۆ خۆیشیان، خۆیانیان بۆ خەڵکی مالایا نەدەزانی. هەربۆیە نەبوونە گوێڕایەڵی ڕێبەرانی مالایا[٢]. چینییەکان بۆ خۆیان بوونە خاوەنی ڕێکخراوە تایبەتییەکان، گرووپە یارمەتیدەرەکان و کۆمپانیا تایبەتییەکان بۆ دیتنەوەی کار. ئەم بارودۆخە بووە هۆی خوڵقانی کێشە و ئاڵۆزی لە دەیەی حەفتای سەدەی نۆزدەهەمدا و گەورە پیاوانی مالایاو کۆمەڵەی نهێنی چینییەکان تووشی تێك هەڵژوون بوون. قووڵایی ئەم کێشەیە کاتێك زیاتر دەردەکەوێ، ئەگەر چوونەسەری ژمارەی دزە دەراییەکان لە گەرووی مالاکا (لە لێواری مالایا)ی بەم قەیرانە گەورەیە زیاد بکەین. ئەم مەسەلانە بە

(١) ئەو بەندەرانەی کە ڕۆژئاواییەکان بە سەپاندنی ڕێککەوتننامە بەسەر چیندا، لەدەستی ئەو دەریان هێنابوو.

(2) Purcell. V., The Chinese in South-East Asia, London, 1965, p.139.



کردەوە وایکرد کە بەریتانیا بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی ڕۆڵی سەرەکیتر لە ناوچەدا بگێڕێ. لەو سەردەمەدا نیمچە دوورگەی مالایا بازاڕێکی یەکجار گرینگ بوو بۆ ئەو کۆمپانیا بازرگانیانە کە لە سەنگاپوور دامەزرابوون.

لە ناوەڕاستی دەیەی حەفتای سەدەی نۆزدەهەم بە بڕیاری بەریتانیا بە مەبەستی دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆ لە ناوچەکانی نیمچە دوورگەی مالایا، ژمارەی ئەو چینییانەی کە لە پیشە جۆراوجۆرەکاندا چالاك بوو، زیادیکرد. دەوڵەتی داگیرکەری بەریتانیا بۆ کەڵکوەرگرتنی زیاتر لەو سەرچاوانە، بۆ خۆی ڕێوشوێنی یاسایی داڕشت و بەڕێوەبردنی ئاسایشی گرتە ئەستۆ. لە نیمچە دوورگەی مالایا ناوەندەکانی نیشتەجێبوونی چینییەکان وەك شارەکانی ئایپۆ[١]، کوالالامپور و سێرمبان پێکهاتن[٢]. سەیر ئەوەیە کە چینییەکان کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا هاتبوونە ناوچەکە، خۆیان وەك کۆچبەری هەتا هەتایی کەماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتبێ و بەشێوەی بەردەوام لەسەر زەوییەکی دیکەدا نیشتەجێ بن، نەدەزانی، بەڵکو پێیان وابوو کۆچبەری کاتین[٣].

بە سەرنجدان بەو باسانەی ئاماژەی پێکرا دەتوانین ئاگاداری پێکهاتەی کۆمەڵگای چینی لەمالایا پێش جەنگی دووەمی جیهانی بین و دەستێوەردان یان دەستێوەردانی بەریتانیا لە کاروباری ئەواندا شی بکەینەوە. لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ زۆربەی چینییەکانی نیشتەجێی نیمچە دوورگەی مالایا کەسانێك بوون کە یان لە چین لەدایکببوون یان دایك و باوکیان چینی بوون. ئەم کەسانە لە ڕوانگەی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بەستراون بە چین و هەموو کاتێك لە هەوڵی گەڕانەوە بۆ ئەو وڵاتە بوون.

جەنگی دووەمی جیهانی و ئاسەوارەکانی بارودۆخی ئاماژەپێکراوی گۆڕی. سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە چین بە ڕێبەرایەتی ماۆستە دونگ[٤]، پێوەندی چینییە کۆچبەرەکانی لەگەڵ خەڵکی خۆجێی بە تەواوی گۆڕی گۆڕانکاریی بارودۆخی چینییەکانی نیشتەجێی مالایا، کە ٤٠ لە سەدی حەشیمەتی ناوچەی پێکدەهێنا، ببووە مەترسییەکی جیددی بۆ یەکپارچەیی خاك و دەسەڵاتی خەڵکی خۆجێی ناوچە.

(1) Ipoh.
(2) Seremban.
(3) Ibid, p.194.
(4) Mao Zedong.

بە راڤەکردنی بارودۆخی چینییەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بۆمان دەردەکەوێ کە ژمارەیەکی زۆر لەوان بە مووچەیەکی کەم لە هەلومەرجێکی زۆر دژواردا ژیاون، لەوپەڕی هەژاریدا گیانیان لەدەست داوە. سەرکەوتنی ژمارەیەکی کەم لەوان نابێ ببێتە پێوانەیەکی گشتی، چونکە زۆربەیان پیشەیەکی ساکاری وەك کرێکاری و کارمەندییان بووە و هیچ کاتێك لە پێگە و پلەوپایەیەکی تایبەتیدا خۆیان نەدیتووەتەوە. بە کورتی نابێ سەرکەوتنی گرووپێکی بچووك بکەینە پێوانەیەك بۆ دۆخی گشتی کۆچبەرە چینییەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا. کەسانێك کە توانیویانە سەرکەوتووبن بارودۆخێکی تایبەتییان بووە. هەلومەرجی ڤییتنام لە قۆناغی حکوومەتی داگیرکەری فەرەنسا لەم پێوەندییەدا کاریگەریی بەرچاوی هەبووە. کاتێك کە فەرەنسا ڤییتنامی باشووری داگیرکرد (کۆتایی دەیەی پەنجای سەدەی نۆزدەهەم) و سایگۆنی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە (١٨٦١) چینییەکان ویستیان رۆڵی بازرگانی کە فەرەنسییەکان و ڤیتنامییەکان ئامادەگی بەڕێوەبردنیان نەبوو، بگرنە ئەستۆ. بازرگانە چینییەکان کە لەم بوارەدا خاوەن ئەزموون بوون توانییان بە ئاسانی نەبزی مللیی ڤییتنام بەدەستبێنن. چینییەکان لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا پیشەیەکیان هەڵبژارد کە کەسانی دیکە پێیان کارێکی نزم و یان ئەوەی کە لەو کارانەدا ئەزموونی پێویستیان نەبوو[1]. بۆوێنە پیشەی دەڵاڵی کە خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وەك پیشەیەکی نزم سەیریان دەکرد و ئامادە بە ئەنجامدانی نەبوون. کاسبکارە چینییەکان کە لەم بوارەدا خاوەن ئەزموون بوون زۆر بەباشی بەڕێوەیان دەبرد و لە ماوەیەکی کورتدا، بە سەرمایەیەکی بوونە بازرگانێکی گەورە. سەرمایەکانی پێویست بۆ ئەم کارە زۆرتر لە رێگای کاری تاقەتپڕوکێن و پاشەکەوتکردن بەدەست دەهات. چینییەکان کە ئوگرییان بەکاربوو بەڵام خاوەن سەرمایەی پێویست نەبوون کەڵکیان لە پێگە و ڕێزی بنەماڵە یان گرووپ، یان کۆمەڵگای نهێنی خۆیان وەردەگرت و سەرمایەی پێویستیان دابین دەکرد. رۆحی هاوکاریی لە نێوان چینییەکان زۆر لە سەرەوەیە، بە پێچەوانەی هیندییەکان کە هاوپێوەندی ئەوان بەشێوەی ((کاست))ـە. هاوپێوەندی نەتەوەیی چینییەکان وای کردبوو کە لە ناوچەی

(1) The Chinese in South-East Asia, pp.50-53.



باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا زۆربەی بازرگانە گەورەکان چینی بن. مەسەلەیەکی دیکە ئەوەیە کە کاتێك چینییەکان سەرمایەی پێویستیان دەست دەکەوت هەموویان بۆ کاری ئاڵوویر (پێکهێنانی شوێنی بازرگانی و یان دوکانی بچووك) تەرخان نەدەکرد، بەڵکو لە کاری جۆراوجۆردا پارە و لێهاتوویی خۆیان وەگەر دەخست. بۆ نموونە قەرزیان دەدایە وەرزێران یان ئامرازی کشتوکاڵییان بەکرێ دەدا و لە بەرامبەردا بەشێك لە بەرهەمەکانیان وەردەگرت. بەکورتی چینییەکان لە هەر کارێکدا کە سوودی تێدا بوایە، دەیانکرد. پشوو درێژی چینییەکان بووە هۆی ئەوەی کە لە ماوەیەکی کورتدا کۆنترۆڵی مالیی ناوچە بگرنە دەست. هێزی ماڵی بووە پێکهێنەری دەسەڵات و بەرەبەرە چینییەکان کەوتنەبەر نەفرەتی خەڵکی خۆجێی، کە لانیکەم بەستراوە بەوان بوون. ئەم نەفرەتە بەهۆی پێوەندی چینییەکان بە دەوڵەتە داگیرکەرەکان بەردەوام زیادیدەکرد. بۆ وێنە، خەڵکی ئەندونیزیا بەهۆی دەڵاڵی کردنی چینییەکان لە بازرگانی تریاکدا بۆ حکوومەتە داگیرکەرەکان، لە چینییەکان بێزار بوون.

هەستی دژە چینی لە کۆمەڵگایەکدا کە بەهۆی مەزهەبیی سووننەتییەوە دەرەتانی وەرگرتنی چینییەکانی نەبوو، زۆرتر بوو. چینییەکان تەنیا لە کامبۆدیا، تایلەند و فیلیپین توانییان تاڕادەیەکی زۆر تێکەڵ بن. لە ئەندونیزیا و مالیزیا بێ مەیلی بەرامبەر بە قبووڵکردنی ئیسلام کۆسپی سەرەکی تێکەڵ بوونی چینییەکان بوو لەو کۆمەڵگایانەدا. بەپێچەوانەوە، لە کامبۆدیا و تایلەند کە بورسیم مەزهەبی سەرەکییە، چینییەکان بە ئاسانی تێکەڵی ئەم کۆمەڵگایە بوون و پاش تێکەڵ بوونی نەژادی بە تەواوی وەردەگیران کلێسەی کاتۆلیکی فیلیپین بە قەد بورسیمی تایلەند و کامبۆدیا نەرمی لەخۆی نیشاننەدەدا، بەڵام لە بەرامبەر رێوشوێنی ئیسلامی لە ئەندونیزیا و مالیزیا، نەرمییەکی زۆرتری نیشان دەدا. دیارە نەرمی نیشاندان یان بە پێچەوانەوە دەگەڕێتەوە بۆ نێوەرۆکی هەر کام لەم مەزهەبانە. بۆ نموونە لە ئایینی ئیسلامدا بۆ کەسانی غەیرە موسڵمان رێوشوێنێك دەگیرێتەبەر کە تاك دەبێ ملی بۆ راکێشی و بنەمایەکە کە دەبێ ملی بۆ راکێشی و بنەمایەکە دەبێ لەبەرچاوی بگرێ وەك مەیخۆری، قومار، سوو و هتد... کە ئیسلام لەم بوارانەدا نەرمی لەخۆی نیشانادا. بەڵام لە مەزهەبی بوودا یا کاتۆلیکدا هیچ گۆڕانکارییەك لە ژیانی پێشووی چینییەکدا هەست پێ ناکرێ. رەوتی تێکەڵبوونی چینییەکان لە کامبۆدیا لە کۆتایی دەیەی شەستی سەدەی بیستەم بەتەواوی بەرچاو بوو. بۆ روونتربوونەوەی ئەم باسە، مەسەلەیەك دێنینە بەرباس.

لە شاری لێوارییی کامپۆت[1] بازرگانی بیبەر لە ئەستۆی چەند بنەماڵە دایە. دامەزرێنەری یەکێك لەم بنەماڵانە لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٦٠دا هێشتا لە ژیاندا مابوو، ئەم کەسە، کە ئەو کات نەوەدساڵی بوو، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لەگەڵ براکەی هاتنە کامبۆدیا. ئەم دوو برایە لەکاتی بەجێهێشتنی ماڵی خۆیان لە دوورگەی گەورەی هاتیان و نیشتەجێبوونیان لە کامبۆدیا تەمەنیان بیست ساڵ بووە. ئەم پیاوە بە تەمەنەی چینی لە نەوەد ساڵیدا لەگەڵ کەم تەمەنترین ئەندامی بنەماڵەکەی سێ نەوە مەودای بووە. کەم تەمەنترین ئەندامی بنەماڵە کە لە تەمەنی بیست ساڵیدا نەیدەتوانی بە زمانی چینی قسە بکا، دروست لە بەرامبەر مافی نەوەد ساڵەی خۆیدا کە نەیدەزانی کامبۆدیای قسە بکا، هەڵکەوتبوو. ئەم لاوە لەڕووی روخسارو پێکهاتەوە لە هاووڵاتییانی کامبۆدیایی جیا نەدەکرایەوە.

چینییە کۆچبەرەکان ڕۆڵی گرینگیان لە مێژووی ناوچەدا گێڕاوە. ڕۆڵی ئابووری ئەوان کە کاریگەریی سیاسی بەرفراوانی بەدواوە بووە، بە تەواوی هەست پێدەکرا. پاش سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستی چین لە ساڵی ١٩٤٩ کێشەیەکی گەورە سەری هەڵدا. چونکە گەڕانەوەی کۆچبەرە چینییەکان بۆ نیشتمانی سەرەکی خۆیان (چ لەڕووی تاکەکەسی و چ سیاسی) ئیمکانی نەبوو. هەرچەند ڕۆڵی کۆچبەرەچینییەکان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە کۆچبەرانی دیکە زیاترە، ئەوانیش ڕۆڵیان هەرچەند کەمیش بوو بێ گێڕاوە. کۆچبەرانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك ئێرانییەکان و عەرەبەکان بەشێوەی بەربڵاو لە سەنگاپوور و شوێنەکانی دیکەی ناوچەدا دەژیان. لە کامبۆدیا و لاوسیش بە هاندانی فەڕەنسییەکان کۆچبەرە ڤییتنامییەکان بۆ بەدەستەوگرتنی کاروباری دەوڵەتی روویان لە زیادبوون کرد. ڤییتنامییەکان، وەك کۆچبەرە چینییەکان لە مالایا، ئەو کارانەی کە خەڵکی لاوس و کامبۆدیا خۆیان لێدەبوارد و قبووڵیان دەکرد. یەکێك لە هۆکارەکانی پەرەپێدانی پێوەندیی سێ وڵاتی هیند و چین، واتە ڤییتنام، کامبۆدیا و لاوس ئەم کۆچکردنانە بوون.

هیندییەکانی نیشتەجێ و کۆچبەریش لەم ناوچەیەدا ڕۆڵی تایبەتییان بووە. لەگەڵ ئەوەی ئاگاداری کۆچی هیندییەکان لە دێر زەمانەوەین، بەڵام حەرەکەتی ئەوان بەرەو ناوچە لە سەدەی نۆزدەهەمدا زۆرتر بووە. هیندییەکان وەك چینییەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەو پیشانەی کە کەسانی دیکە ئامادە بە ئەنجامدانی نەبوون، روویان کردە ناوچە. چونکە لە وڵاتەکەیاندا هەژاری و

(1) Kampot.



بێکاری پەرەی ئەستاندبوو. کۆچبەرە هیندییەکان لە سەرتاسەری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بڵاوببوونەوە، بەڵام زۆربەیان لە ناوچەکانی بێرمە، مالایا (مالیزیا و سەنگاپوور) نیشتەجێ بوون. هۆی ئەم کارەش بە تەواوی روونە. هیندستان لەژێر دەسەڵاتی سیستەمی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیادا بوو و ڕەوتی کۆچکردن لە هیند زۆرتر بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا بوو[1]. زۆربەی هیندییە کۆچبەرەکان خەریکی کاری دەستن، بەتایبەت کار لە کێڵگەکان، لە کاروباری ڕێگاوبان و دروستکردنی ڕێگای ئاسن بوون. ئەمڕۆکەش بایەخی کرێکارە هیندییەکان لە وڵاتانی وەك مالیزیا بە تەواوی بەرچاوە. هیندییەکان وەك چینییەکان پیشەی جۆراوجۆریان بووە. هەندێك لەوانە لە هیندستان کاری پاراستنی ئاسایش و سەربازییان پێ ئەسپێردراوە و ڕەوانەی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کراون بەشێکی دیکەیان خەریکی پارە گۆڕینەوە و زۆرتر سووخۆری بوون و بەهۆی دانی قەرز بە وەرزێڕان، دەکەوتنە بەر نەفرەتی گشتی. سووخۆریی هیندییەکان لە بێرمە بەجۆرێك بە لوتکە گەیشت و بووە هۆی نەفرەتی خەڵك کە پاش سەربەخۆیی وڵاتی بێرمە لە ساڵی ١٩٤٨ بە کۆمەڵ لەو وڵاتە دەرکران.

هیندییە کۆچبەرەکان کە کەوتبوونە بەر شاڵاوی گەشەی ئابووری سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، وەك کۆچبەرەکانی دیکەی ناوچە لەم دۆخە کەڵکیان وەرگرت و ژمارەیەك لەوان لەڕووی هێزی ماڵی و پێگەی کۆمەڵایەتییەوە گەیشتنە ئاستێکی بەرز. هیندییە کۆچبەرەکان لە کارەکانیاندا وەك بازرگانیکردن، پارێزەری و پزیشکی زۆر سەرکەوتوو بوون. ژمارەیەك لە هیندییەکان، دیارە نەژمارەیەکی زۆر، توانییان لە ناوچەدا بگەنە ئاستی چینییەکان. لەوەی کە تەنیا ژمارەیەکی کەمیان ئەم سەرکەوتنەیان بەدەستهێنا دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە لە چوارچێوەی داخراوی ((کاست))دا دەژیان، ئەوان شوێنی بازرگانیکردنیان لە ئاستی بنەماڵەدا دامەزراند و لە پەرەپێدانی لە دەرەوەی بنەماڵەدا خۆیان دەپاراست. کەوابوو سەرکەوتنیان بەستراوە بوو بە هەرێمی بنەماڵە و هیچ کات وەك چینییەکان کە وەك نەتەوە یان کۆمەڵگایەکی چینی دەردەکەوتن، هەڵسووکەوتین نەدەکرد. هەر بۆیە خاوەنی کۆمپانیا گەورەکانی بازرگانی چینی بوون. بەڵام لە پیشەکانی وەك پارێزەری هیندییەکان سەرکەوتووتر بوون، لە حاڵی حازردا لە وڵاتانی وەك مالیزیا و سەنگاپوور زۆر چالاکن بەشێوەیەك کە زۆربەی پارێزەرانی ئەم دوو وڵاتە بە ڕەگەز هیندین[2].

(1) Indians in Malaya: Immigration and Settement, p.177.
(2) The Indianized States of Southeast Asia, p.144.

کۆچی ئاسیاییەکان بۆ ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا یەکێك بوو لە گرینگترین رووداوەکانی سەدەی نۆزدەهەم. کۆچبەران هێزی کارو سەرمایەی پێویستیان بۆ پەرەپێدان و ئاڵوگۆڕی ناوچە دابین کرد و بوونە هۆی گۆڕینی سیستەمی نەریتی بە سیستەمێکی نوێ. کۆچبەرە چینییەکان کە لە سەنگاپوور ٧٥ لە سەد و لە مالیزیا ٣٣ لە سەدی حەشیمەت پێکدێنن، بەردەوام رۆڵی گرینگیان گێڕاوە. کۆچبەرە هیندییەکان لە مالیزیا ١٥ لە سەد و لە سەنگاپوور ٨ لە سەدی حەشیمەتی ئەم وڵاتانە پێکدێنن، کاریگەریی ئەوان لە بێرمەش حاشا هەڵنەگرە.

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا کۆچبەرە ئاسیاییەکان کێشە و گیروگرفتی زۆریان نایەوە. ئەوان زۆرتر ئەو کارەیان دەکرد کە خەڵکی خۆجێی پێیان کارێکی نزم بوو، یان روویان لە هەندێك کار دەکرد کە خەڵکی خۆجێی لێهاتوویی پێویستیان لەودا نەبووە و بەرەبەرە ئەم جۆرە کارانەیان خستە پاوانی خۆیانەوە. خەڵکی خۆجێی دواتر بەهۆی دەست رانەگەیشتن بەو کارانەی کە لە ئەستۆی کۆچبەران بوو- تەنانەت سەرەڕای توانایی و وەدەستهێنانی شارەزایی پێویست هەروا لێی بێبەش بوون- کێشەیان لێ پەیدا دەبوو. خەڵکی خۆجێی وەك تابووری پێنجەمی هێزە ئەوروپاییەکان دەیانڕوانییە کۆچبەرە ئاسیاییەکان و لە بەرامبەریاندا رادەوەستان. (بێرمە وێنەیەك لەم جۆرە هەڵوێستانەیە کە خەڵکەکەی پاش سەربەخۆیی، کۆچبەرە هیندییەکانیان دەرکرد). بەم جۆرە، کۆچبەرە ئاسیاییەکان تووشی کێشەیەك هاتن کە بە کردەوە رێگای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی دایك نەبوو و لەلایەکی دیکەشەوە لەو وڵاتانەی کە تا ئەو کات هەڵسووڕانیان بووە، چیدیکە وەرنەدەگیران. خەڵکی خۆجێی بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕان کە دژی کۆچبەران شۆڕش بکەن، بە جۆرێك کە لە ساڵی ١٩٦٥ لە ئەندونیزیا شۆڕشێك بەرپا بوو، بەپێی وتەی بەرپرسانی غەیرە رەسمی زیاتر لە ٢٥٠ هەزار چینی، لە رووداوەکانی پاش کودیا لەم وڵاتە کوژران. جیاوازییەك کە لە نێوان کۆچبەرە ئاسیاییەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و کۆچبەرە ئەوروپاییەکان لە ئەمەریکا و ئوسترالیادا هەیە ئەمەیە، کە کۆچبەرە ئەوروپاییەکان هیچ کات لەگەڵ بەربەرەکانێی جیددی حکوومەتەکان لە ناوچە تازەکاندا رووبەڕوو نەبوون، بەڵام کۆچبەرە ئاسیاییەکان بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن لە ناوچەیەکدا کە کۆچیان بۆ کردووە، وەك ئەندامی کۆمەڵگا وەربگیرێن. ئەم کۆچبەرانە هەرچەند رۆڵی گرینگیان لە ئابووری ناوچەدا دەگێڕا، لە زۆر رووەوە بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن لە ریزی ئەربابەکان یان هەڵبژێردراوە سیاسییەکانی ئەو کۆمەڵگایانە جێگایان ببێ.

# فەسڵی هەشتەم

## باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لە نێوان دوو جەنگی جیهانیدا

لە ساڵەکانی نێوان دوو جەنگی جیهانی لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا جیاوازییەکی بەرچاو دەبینریٚ. لەو ماوەیەدا، لە حاڵێکدا حکوومەتە داگیرکەرەکان (بەریتانیا لە مالایا، هۆڵەندا لە ئەندونیزیا، فەرەنسا لە هیند و چین و...) لەوپەڕی دەسەڵاتدا بوون، دەسەڵاتە ناوچەییەکان بەوان بەستراوە بوون، بەتووندی کەوتبوونە ژێر فشاری سیاسییەوە و کۆڵەکەی دەسەڵاتەکەیان لەرزۆك دەدی. هەندێك جار، داگیرکەران ئەم فشارانەیان قبووڵکردووە یان لانیکەم دانیان پێدادەنا، بەڵام هەندێك جاریش بەبێ بایەخانە سەیریان دەکرد و حاشایان لێدەکرد. بەم جۆرە، لەوسەردەمەدا کە هێزە رۆژئاواییەکان لە ناوچەدا بەشێوەی بەربڵاو دەسەڵاتیان هەبوو، هێزە خۆجێی و خەڵکییەکان کە سەریان هەڵدابوو بۆ حکوومەتە داگیرکەرەکان ببوونە مەترسییەکی جیددی. سەرئەنجام بەهۆی بوونی هەندێك ئیمکانات و پێکهێنانی بارودۆخێکی تایبەتی بۆ وێنە هاتنی ژاپۆن بۆ ناوچەکە لەکاتی جەنگی دووەمی جهانی ، دەرەتانی لاوازکردنی حکوومەتە دەستکردەکانی رەخساند. تا دەیەی ١٩٢٠ خەبات دژی وڵاتە زلهێزەکان لە ئاستێکی سەرەتایی و بە چەکی سوونەتی بوو، دوای ئەم قۆناغە بزووتنەوەی سیاسی نویٚ لە ناوچەدا شکڵی گرت کە ئامانجی سەرتر لە شکستی داگیرکەران بوو و بەپێی بیرۆکەی شۆڕشگێری و سیاسی پڕۆگرامەکانی داڕشتبوو.

هەروەك ئاماژەی پێکرد وڵاتە داگیرکەرەکان پێش ئەم قۆناغەش لەگەڵ خۆڕاگری خەڵکی ناوچە بەرەو رووبوون. لە سەدەی نۆزدەهەمدا، کاتێك کە هۆڵەندییەکان ویستیان پەرە بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بدەن لەگەڵ خۆراگری و خەباتی توندی خەڵکی ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئەندونیزیا، بەتایبەت ناوچەی ئاچە لە سۆماترا، بەرەو رووبوون[1]. لە بێرمە، بەریتانیا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی چەندین ساڵ لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە شەڕی کرد کە نیشانەی دژایەتی خەڵك لەگەڵ سیستەمی داگیرکەری وکۆلۆنیاڵیزمی بەریتانیادا بوو. سەرەڕای ئەمەش، زۆربەی خەبات و بزووتنەوەکانی پێش جەنگی دووەمی جیهانی گەشەی پێویستی نەکردبوو.



وەرچەرخانی بزووتنەوەکان لە حاڵەتی نەریتی بۆ شۆڕش دژی کۆلۆنیاڵیزم، وەك گەشە و پەرەپێدانی ناسیۆنالیزم لێك دەدرایەوە. لەگەڵ ئەوەی لەم راڤەکردنەدا هەندێك خاڵی باشی تێدایە، بەڵام کامڵ نییە. چونکە دەبێ بزانین خودی ناسیۆناڵیزم چییە، ئایا ناسیۆناڵیزم لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وەك ناسیۆناڵیزم لە ئەوروپا یان ئەمەریکای لاتینە؟ ئەگەر بەڕاشکاوی باسی بکەین، دەبێ بڵێین کە بزووتنەوە سیاسییەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەگەڵ بزووتنەوەکانی پێشتر، بەتایبەت لە سەدەی نۆزدەهەم، جیاوازە. دیارە ئەم باسە بەم مانایە نییە، کە بزووتنەوە سیاسییە نوێیەکان بەبێ سەرنجدان بە بزووتنەوەکانی رابردوو دروست بوون، بەڵکو ئەزموونی رابردوو و هەڵسەنگاندنی خاڵە بەهێز و لاوازەکان لەگەڵ بارودۆخی نوێی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری، شێوەی بزووتنەوەی نوێی داڕشتووە.

بزووتنەوەی سەربەخۆییخوازانەی نوێی ئەندونیزیا، کە ئامانجەکەی کۆتایی هێنان بە حکوومەتی داگیرکەر و هێنانی حکوومەتێکی نویٚ و سەربەخۆ بوو، بە باشترین شێوە پێوەندی نێوان ئەزموونی رابردوو لەگەڵ پڕۆگرامە سیاسییەکانی نیشاندا. ئەو خەباتگێڕانەی کە لە دەیەی ١٩٢٠دا پێشڕەوی بزووتنەوە بوون، بەباشی ئاگاداری خەباتی پێشینیانیان دژی هۆڵەندییەکان بوون و شێوازی خەباتیان بەپێی بارودۆخ و هەلومەرجی نویٚ بەکاردەهێنا. خەباتی ئەندونیزیاییەکان دژی هۆڵەندییەکان لە شەڕەکانی جاوە (١٨٢٥-١٨٣٠) و پادری (دەیەی بیست و سیی سەدەی نۆزدەهەم) و (ئاچە) (١٨٧٢-١٩٧٠) نموونەی سەرەکیی خەباتی شۆڕشگێڕانی نوێی ئەندونیزیایی بوو. کەسانێك وەك ئەحمەد سوکارنۆ، یەکەمین سەرۆك کۆماری وڵاتی سەربەخۆی ئەندونیزیا، بایەخیان دەدایە هەندێك هۆکار کە هیچ کات رێبەرانی پێشوو سەرنجیان نەدەدایە یان تەنانەت بیریشیان لیٚ نەکردبووەوە. گرنگترینی ئەم هۆکارانە ئەوەبووە کە هەستیان بەو پێویستییە کردبوو، کە بەبێ سەربەخۆیی و رزگاری لەژێر دەستەیی

---

(1) A History of Modern Indonesia, p.68.

پێکهێنانی وڵاتی نوێ لە ئەندونیزیا مسۆگەر نابێ. وڵاتی نوێ هەموو گرووپە نەژادییەکانی دوورگەی ئەندونیزیای لەخۆدەگرت. ئەم کارە لە بنەڕەتدا دروشمی نەتەوەیی ئەندونیزیا، واتە ((یەکگرتن لە جۆراوجۆرییەکان)) دەهێنایە دی. دەبووایە وڵاتێك پێك هاتبایە کە پێش رەتکردنەوەی کۆلۆنیالێزم لەبیری یەکگرتندا بووایە. یەکگرتنێك کە لەسەر بناغەی نەریتەکانی رابردوو و بایەخە نوێیە سیاسییەکان بێ کە هەندێکیان لە ئەورووپا وەرگیرا بوون. ناسیۆنالێزم لە ئەندونیزیا و ناوچەکانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بنەمایە بوو، کە خەڵکی هەر ناوچەیەك خاوەنی مافی بێ ئەم لا و ئەولای دیاریکردنی چارەنووسی خۆیەتی و دەسەڵات لەلایەن ئەو خەڵکەوە بەڕێوەدەچێ، کە لە ناوچەیەکی جوگرافیاییدا دەژین. هێزە داگیرکەرەکان دژایەتییان لەگەڵ داخوازی رەوای ئەم خەڵکەدا کرد و بەهۆی زاڵبوونی هێزی سەربازییان ئامادەی هیچ چەشنە رێککەوتنێك نەبوون[1]. بەڵام خەڵك لە رێگای بزووتنەوەی رزگاریخوازانە، کە لە بنەڕەتدا ورەی بەهێز و قایمی لە پشت بوو، سەرەڕای لەمپەرەکانی سەر رێگای، داکۆکی لە مافەکانی دەکرد.

ئەوەی کە بۆچی ئەم ورەیە پێشتر نەبووە و لە دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ پێکهات، هۆیەکەی چوونە سەری ئاستی وشیاری گشتی لەم قۆناغەدا بوو. وشیاری خەڵك و ئاگاداربوون لە بارودۆخی خراپی خۆیان بە کردەوە پاش تێگەیشتن لە خەباتی خەڵك لە وڵاتانی دیکە بەتایبەت لە ئەورووپا بوو. بیروباوەڕی خەباتگێرانە و ناسیۆنالێستی لەم رەوتە نوێیەدا رۆڵی سەرەکی بووە و گڕ و تینی بێ وێنەی لەنێو خەڵکی ناوچەدا پێکهێنا. هێرشی ئەندێشە سیاسییەکانی رۆژئاوا وەك دیموکراسی، سوسیالێزم وکۆمونیزم کاتێك روویدا کە نارەزایەتی لە حکوومەتە داگیرکەرەکان بەوپەڕی خۆی گەیشتبوو و خەڵك لە ئەندێشە نوێیەکاندا بەدوای رێگای رزگاریدا دەگەڕان. لە سەدەی پەرەپێدان و گشتگیرکردنی بارهێنان بوو بە بارهێنانی هەمەلایەنە و پەرەپێدانی لە ئاستی بەربڵاودا دەرەتانی ئاگاداربوون لە گۆڕانگارییە رووناکبیرییەکان لە ئەورووپا و ناسینی ئەو پێکهاتانەی کە گۆڕانکاری ئاماژە پێکراو پێك هێنابوو، دەرەخسێنێ. کاتێك کە خەڵك توانییان لە دیاردە نوێیەکان و گۆڕانکارییە سیاسییەکان تێ بگەن، هەستی نەتەوایەتییان بەهێز دەبێ. سەرەڕای ئەمەش لەدوای پەرەپێدانی بارهێنان و پێکهێنانی

(1) Zainuddin, A.; Short History of Indonesia; North Melbourn, 1986, pp.174-177.



گۆڕانکاری نوێ لە پێکهاتەی ئیداری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا، توێژێك وەك رووناکبیر ناسران. ئەم توێژە لەگەڵ خوێندەوارانی پێش خۆیان جیاوازییان هەبوو. (لە ڤییتنام پێشتر بەهۆی بوونی سیستەمی ماندارین توێژی رووناکبیر هەبوون، بەڵام گرووپی نوێ، توێژێکی نوێخوازبوون کە لەگەڵ گرووپی دواکەوتووی پێش خۆیان بەراورد نەدەکران). بۆ یەکەم جار، دەستەیەك لە فێرخوازان خەباتیان دژی دەسەڵاتدارانی داگیرکەر دەست پێکرد و بە کەڵکوەرگرتن لە ئەندێشە و چەمکە نوێیە سیاسییەکان مەبەستی نەتەوایەتی خۆیان تاقیب دەکرد.

پەروەردەکردن و بارهێنان زۆرتر بەشێوەی رۆژئاوایی و چەندین رێگای هەبوو. بۆ هەندێك کەس، بارهێنان لە رێگای فەرمییەوە بوو، واتە خوێندن لە قوتابخانە، زانکۆ یان مانەوە لە ئەورووپا. ژیانی سیاسی محەمەد هاتا، رێبەری ئەندۆنیزیا، و هۆشی مین، رێبەری ڤییتنام، دوو نموونەی بەتەواوی جیاوازن کە دەریدەخا رێبەرانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا چۆن لەگەڵ ئەندێشە سیاسییەکانی رۆژئاوا ئاشنا بوون و لەوان بۆ کۆتایی هێنان بە سیستەمی کۆلۆنیالیستی لە وڵاتەکەیان کەڵکیان وەرگرتووە. لە ڕوانگەی دەوڵەتی داگیرکەری هۆڵەنداوە، هاتا خوێندکارێکی نموونەیی بوو کە بەشی زۆری قۆناغی لاوێتی خۆی لە وڵاتی هۆڵەندا بە خوێندنەوەی ئابووری تەرخان کردووە. ناوبراو لە قۆناغی خوێندنیدا لە هۆڵەندا، لێوەشاوەیی خۆی وەك خوێندکارێکی هەڵکەوتوو سەڵماند. هاتا لە ماوەی خوێندنیدا بۆی دەرکەوت کە شێوازی هۆڵەندییەکان لە بەڕێوەبەری کاروباری وڵاتی خۆیان، لەگەڵ شێوازی ئەوان لە ئیدارەکردنی وڵاتی داگیرکراوی وەك، ئەندونیزیا بە تەواوی جیاوازە. هەربۆیە لە گەڕانەوەیدا بۆ وڵاتەکەی یەك دەنگ لەگەڵ خەباتگێڕانی دیکە بانگی سەربەخۆییخوازی بەرزکردەوە و خەباتی دژی جیاوازی دەست پێکرد، ئەم کارە زیندانی کرانی ناوبراوی لەلایەن هۆڵەندییەکانەوە لێکەوتەوە. هاتا دوای ماوەیەکی دوور و درێژ کاتێك کە ژاپۆنییەکان لە قۆناغی جەنگی دووەمی جیهانی ، ئەندۆنیزیایان داگیرکرد، لە دیلیەتی رزگاری بوو[1].

ئاشنایی هۆشی مین لەگەڵ رۆژئاوا لە رێگایەکی بە تەواوی جیاوازەوە بوو، ناوبراو هیچ کات خوێندکارێکی نموونە و جێگای دڵخوازی فەرەنسییەکان نەبوو، بەپێچەوانەوە

(1) Ibid, P.125.

خوێندکارێکی سەربزێو بوو کە باوکی ئامادە نەبوو لەگەڵ حکوومەتی داگیرکەری فەرەنسا رێك بکەوێ. هۆشی مین لە هەرەتی لاوێتیدا ڤییتنامی بەجێهێشت و وەك خزمەتکاری کەشتی خۆی گەیاندبووە ئەورووپا. ناوبراو لە لەندەن و پاریس پیشەیەکی کەم بایەخی هەبوو. لە پاریس بەرەبەرە لەگەڵ بەرهەم و ئەندێشەی سیاسی کارل مارکس، ئێنگلس، لێنین و لایەنگرانی ئاشنا بوو. هۆشی مین کومۆنیزمی وەك تەنیا قوتابخانەی رزگاریدەری وڵاتەکەی دەزانی[1]. ناوبراو یەکێك لە دامەزرێنەرانی حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنسا بوو. لایەنگری لە کۆمۆنیزم چارەنووسی خەڵکی ڤییتنامی بەتەواوی گۆڕی.

بەم جۆرە، هەموو گرووپە رووناکبیرییەکان بەدەستراگەیشتن بە زانست و ئەندێشە سیاسییەکانی رۆژئاوا ئاگاداری دژایەتی و جیاوازی گەورە لەنێوان ژیان و سیاسەت لە وڵاتە زلهێزەکان و وڵاتی داگیرکراودا بوون. ئەم بارودۆخە بەرەبەرە پەرەی بە ناکۆکی نێوان وڵاتانی زلهێز و خەڵکی وڵاتە داگیرکراوەکان دا و رق و بێزاری خەڵك حاڵەتێکی قەیراناوی بەخۆوە گرت. دەسەڵاتی ئابووری و هەڵاواردنی کۆمەڵایەتی بووە هۆی شۆڕشی سەربەخۆییخوازی. خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لە خۆیان دەپرسی ئایا ئەندێشە ئابووری و سیاسییەکانی رۆژئاوا دەتوانێ چارەسەری کێشەکانیان بکا. لەم بارودۆخەدا کۆمۆنیزم وەك قوتابخانەیەکی رزگاریدەر زیاتر لە پێشوو کەوتەبەر تێڕامان و لێوردبوونەوە. دوای نزیك بە ٧٥ ساڵ هێشتا رۆڵی سەرەکیی شۆڕشی بۆشەڤیکی ١٩١٧ لە بزواندنی خەڵکی ئەم ناوچەیە جێگای باس و دیالۆگە. لە روانگەی ئەم خەڵکە شۆڕشی بۆشەڤیکی تەنیا نەبووە هۆی رووخانی رژێمی گەندەڵی رووسیا، بەڵکو وەك رێخۆشکەر و چرای رێگای خەبات لەگەڵ حکوومەتە داگیرکەران لێك دەدرایەوە. هەندێك لە وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لە کەڵك وەرگرتن لە قوتابخانەی کۆمۆنیزم لە دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ بەکردەوە خەباتیان دەست پێکرد.

سەرنج راکێشی کۆمۆنیزم لە ڤییتنام شتێکی بەڵگە نەویست بوو و لە ئەندونیزیا و فیلیپینیش تاڕادەیەك هاتبووە بەرباس. لە مالایا کۆمۆنیزم چووبووە نێو کۆبوونەوەی چینییەکانی ئەم وڵاتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا، گۆڕانکارییەکانی مالایا بەشێوەیەك لەگەڵ وڵاتانی دیکە جیاوازیی هەبوو. ئەو چینییانەی کە لە مالایادا بوون لە دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠

(1) Marr, D., Vietnamese Anticolonialism 1885-1925, Berkeley, Cal. 1973, p.73.



پێوەندییەکی راستەوخۆیان لەگەڵ وڵاتی خۆیاندا هەبوو[1]. هەربۆیە ئامانجی ئەوان لە پشتیوانی لە کۆمۆنیزم خەبات لەگەڵ بەریتانیا نەبوو، بەڵکو پشتیوانی ماڵی و سیاسی لە هاووڵاتییانی خۆیان لە چین بوو. رەنگە ئەم پرسیارە بێتە گۆڕێ، کە بۆچی حیزبی کۆمۆنیست تەنیا لە ڤییتنام بەدەسەڵات گەیشت. لە هەر دە وڵاتەکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا تەنیا ڤییتنام و ئەندونیزیا بوون کە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی خۆیان ناچار بوون شەرێکی درێژخایەن بکەن. دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەو دوو وڵاتە دژی وڵاتانی فەرەنسا و هۆڵەندا، کە ویستیان جارێکی دیکە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەواندا و بەشێوەی گشتی سەرتاسەری هیندوچیندا بسەپێنن، شەڕیان کرد، لە حاڵێکدا لە وڵاتانی دیکەی ناوچە، وڵاتانی کۆلونیالیزمی رۆژئاوا، رێگایەکی دیکە و بە ناو رێگایەکی نوێیان بۆ درێژەدانی دەسەڵاتی خۆیان گرتبووە پێش.

جیاوازی ئەزموونی ڤییتنام و ئەندونیزیاش جێگای سەرنجە، ئەوەیە کە بۆچی کۆمۆنیستەکان لە ڤییتنام رێبەرایەتی بەرگریی نەتەوەییان دژی فەرەنسییەکان بەئەستۆوە بوو، بەڵام لە ئەندونیزیا تەنیا یەکێك لە گرووپە سیاسییەکان بۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەیان خەباتیان دەکرد. هۆی ئەم کارە تاڕادەیەك دەگەڕایەوە بۆ رێبەران و کەسایەتییە خەباتگێڕەکانی ئەم دوو وڵاتە. لە ئەندونیزیا رێبەرانی کۆمۆنیست کەسانی زۆر لێهاتوو و دیاربوون، دیارە رێبەرانی نەتەوەیش لەم وڵاتەدا بوون کە پلەیەکی یەکسان یان تەنانەت سەرتر لەوانیان هەبوو. هەردوو رژێم سەرکوتکەر بوون، بەڵام رێژیمی فەرەنسا لە بەراورد لەگەڵ هۆڵەندا توندوتیژتر بوو. هەرچەند بەڕێوەبەرانی هۆڵەندی لە سەرکوت و زیندانی کردنی رێبەرانی نەتەوەیی ئەندۆنیزیا وەك ئەحمەد بوکارنۆ، محەمەد هاتا و سجاهیر[2]، خۆیان نەدەبوارد، بەڵام دژکردەوەی رژێمی فەرەنسا لە بەرامبەر خەباتگێڕانی ڤییتنامی توندتر بوو.

سەرکوتی بێ بەزەییانی ڤییتنامییەکان لە دوو دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ بەکردەوە بووە هۆی لەنێوچوونی زۆربەی گرووپە سیاسییەکان لەو وڵاتەدا. سەرەڕای ئەمەش، حیزبی کۆمۆنیستی ڤییتنام رێکخستنی نهێنیی هەبوو، کە فەرەنسییەکان توانای ئاشکراکردنیان نەبوو، هەربۆیە هەموو کاتێك گلەییان لە بێ توانایی خۆیان بۆ لەنێوبردنی رێکخستنە نهێنییەکانی

(1) Community and Nation, Essays on Southeast Asia and the Chinese. Pp.19-20.
(2) Sjahir.

کۆمۆنیستەکان بووە. لە هەمووی گرینگتر هۆی سەرەکی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان لە ڤییتنام دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکخستنی بیرۆکە سیاسییەکان و دیاریکردنی پرۆگرامی گونجاو بۆ بەڕێوەبردنی بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ڤییتنام. ئابووریی کۆلۆنیالیستی ڤییتنام وێنەیەك بوو لەو ئابوورییە کۆلۆنیالیستانەی کە لە بەرهەمەکانی مارکس و بەتایبەت لینیندا باسکرابوو. کۆمۆنیستەکانی ڤییتنام وەك هێزی پێشڕەوی سیاسی، لە وڵاتێکدا سەریان هەڵدا کە ناسنامە نەتەوەییەکەی مێژووییەکی کۆنی هەبوو (وڵاتانی دیکەی ناوچە هیچ کات خاوەنی ئەم ناسنامە نەتەوەییە نەبوون). ڤییتنام لە کۆنەوە سیستەمی بەهاکان و پێوانە ڕەهاکانی هەبووە، کە کونفۆسیۆس دامەزرێنەری بوو، بەڵام بەهۆی لاوازی لە بەرامبەر داگیرکەراندا تووشی کێشە هاتبوو. بەڵام لە ئەندونیزیا مەسەلەی ناسنامەی نەتەوەیی بۆ خۆی دیاردەیەکی تاڕادەیەك نوێ بوو کە لە کۆمەڵگایەکی پڕ لە جۆراوجۆری نەتەوایەتیدا سەری هەڵدابوو، جگە لەوەش ئەندۆنیزیا تووشی ئەو بارودۆخە نەهات کە لە ڤییتنامدا بوو و پێویستی بە بنەماکانی کۆمۆنیزم بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە نەبوو[1]. خەڵکی ئەندۆنیزیا بەردەوام داهاتوویان لەپێش چاوبوو کە دەبێ نەریتە لە مێژینەکانی لە وڵاتدا بپارێزرێ. ئەوان هیچ کات بەرامبەر بە ئامۆژگارییەکانی ئیسلام تووشی گومان نەهاتن، بەڵکو بە پێداگرتن لەسەری، ڕێگای داهاتوویان خۆش دەکرد. لە هەموو گرینگتر، خەڵکی ئەندۆنیزیا فەرهەنگی خۆیان زۆر پێ دەوڵەمەندتر بوو لە بیرۆکەی نوێی سیاسیی ڕۆژئاواییەکان. بۆ نموونە ئەحمەد لوکارنۆ، قارەمانی نەتەوەیی ئەندۆنیزیا، وێنەی کەسێکی سووننەتی بوو کە خاوەنی زۆربەی تایبەتمەندییەکانی خەڵکی ئەندۆنیزیا و بەتایبەت جاوە بوو. دیفاعی لوکارنۆ لە هەڵوێستی نەتەوەیی خۆی، کاتێك کە لە ساڵی ١٩٣٠ لە دادگای هۆڵەندی موحاکمە دەکرا، نیشاندەری زانیاری و تێگەیشتنی ناوبراو بوو لە نەریت و فەرهەنگی خۆی و بەستراوەیی بەو و هەر ئەمە ناوبراوی لە ڕێبەرانی دیکەی ناوچە کە خۆیان بەجۆرێك لە ڕابردوو دابڕیبوو، جیادەکردەوە. هەربۆیە کەسانێك کە لە ئەندۆنیزیا دژی هۆڵەندا خەباتیان دەکرد پێویستیان بە بنەما سیاسییەکانی قوتابخانەی کۆمۆنیزم نەبوو. ناسیۆنالیزمی ئەندۆنیزیا زۆربەی بیروبۆچوونە سیاسییەکانی لەخۆ دەگرت و بەتەواوی لەگەڵ بزووتنەوەی ڤییتنام، کە هاوتای کۆمۆنیزمی دەزانی، جیاوازبوو.

(1) Kashin, G. MCT, Nationalism and Revolution in Indonesia, Ithaca, N.Y. 1952, p.116.



جیاوازی ئەندۆنیزیا و ڤییتنام لە وەرگرتنی کۆمۆنیزم، ئاماژەیەکە بۆ پێشکەوتنی لەسەرەخۆی ئەم قوتابخانەیە لە ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. لە تایلەند، تێپەڕبوون لە سیستەمی نەریتی بۆ سیستەمی نوێ تاڕادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی شا، واتە ئیمپراتۆر مونگوت[1] (١٨٥١-١٨٦٨) و ئیمپراتۆر چولالونگورن[2] (١٨٦٨-١٩١٠). ئەم بزووتنەوەیە لە ساڵی ١٩٣٢ بە شۆڕشی ئەم وڵاتە گەیشتە لووتکە.

شۆڕشی ١٩٣٢ لە تایلەند لە ڕاستیدا گۆڕانکارییەکی زۆری لە سیستەمی حکوومەتی ئەم وڵاتەدا پێکهێنا. چونکە دوای ئەو حکوومەتی ڕەهای پاشایەتی بووە سیستەمی مەشرووتە. بەرهەڵستکاران کە پێیان لەسەر ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە سیستەمی حکوومەتی دادەگرت، زۆربەیان ئەو لاوانە بوون کە لە دەرەوە خوێندبوویان و لەگەڵ کۆمۆنیزم بێگانەبوون. ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانە کە لە تایلەند ڕووی داوە لە چوارچێوەی سیستەمێکدا بووە کە لەودا هۆگری بە یەکگرتنی نەتەوەیی، ڕێزلێنان لە پاشا و گەورەیی بودیسم هەروا کۆڵەکە و بناغەی سەرەکی بووە. لەبەر ئەم هۆکارانە بوو کە تایلەند لە ناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا جیاوازبوو[3].

خەڵکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە بزووتنەوەکانیان سەرەڕای شۆڕشی ١٩١٧ی ڕووسیا و یەکگرتنی نەتەوەیی تایلەند کەوتبوونە ژێر کاریگەری لایەنەکانی دیکە، لەوانە سەرکەوتنی ژاپۆن لەشەڕ لەگەڵ ڕووسیا لە ساڵی ١٩٠٥ و شۆڕشی بورژوا-دیموکراتی چین لە ساڵی ١٩١١. ئیسلام و بورسیم لە وڵاتانی ناوچەدا دوو هۆکاری گرینگ بوون لە بەرامبەر دەسەڵاتی کۆمۆنیزم و هەردوو هۆکار شێوازی نەتەوەییان بەخۆوە گرت و ڕێگایان لە کۆمۆنیزم بەست[4]. دینی ئیسلام و ئامۆژگارییەکانی قورئانی پیرۆز هۆکاری گرینگ بوو بۆ ئەوەی گرووپە جۆراوجۆرەکانی وڵاتی ئەندۆنیزیا لە بەرامبەر داگیرکەراندا یەکگرتوو بکا. خەڵکی ئەندۆنیزیا کە ڕێگای ڕزگارییان لەژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم لە ئیسلامدا دیتبووەوە توانییان بگەن بە ڕێککەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی. یەکەمین ڕێکخراوی نەتەوەیی لە ئەندۆنیزیا ((یەکگرتنی

(1) Mongkut.
(2) Chulalongkorn.
(3) Wyatt, D. K. Thailand. A short History, New Havan, Conn, 1984, p.188.
(4) Indonesian Sociological Studies, Part one, p.34.

ئیسلام)) بوو کە لە ساڵی ١٩١٢ دامەزرا. ئەندامانی سەرەتایی ئەم گرووپە، بازرگانەکانی قوماش بوون کە لە ساڵی ١٩٠٨ بەمەبەستی بەربەرەکانی لەگەڵ دەلاڵە چینییەکان لە دەوری یەك کۆببوونەوە. ئەم گرووپە ئیسلامیان وەك هۆکاری نزیك بوونەوەی خۆیان دەزانی و لە خەبات دژی هۆڵەندییەکان و چینییەکان کە بازرگانی وڵاتیان لەدەستدابوو، بۆچوونی هاوبەشیان هەبوو.

لە مالایاش لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئیسلام هەر ئەم رۆڵەی گێڕا، دیارە هەندێك کەمرەنگتر. بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ پاوانخوازی بەریتانیا لە مالایا، کە کۆمەڵگایەکی چەند رەگەزی بوو و کۆمەڵگای چینی و هیندی لەو وڵاتەدا رۆڵی سەرەکییان دەگێڕا، ئیسلام تەنیا هۆکاری پێوەندی خەڵکی خۆجێی ئەم وڵاتە بوو. مالاییەکان بۆ گرتنەبەری هەڵوێستی هاوبەشی ئابووری و سیاسی، پێویستی دەکرد لەم مەسەلەیە کەڵکیان وەربگرتبایە. لەگەڵ ئەوەی کە بزووتنە ئیسلامییەکانی مالایا کە لە دوو دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ سەری هەڵدا، بە ئەندازەی بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە ئەندۆنیزیا بەربڵاونەبوون، ئاسەواری درێژخایەنی زۆرتر بوو و ئیسلام لە نێوان گرووپە جۆراوجۆرەکانی مالایادا یەکگرتوویی پێك هێنابوو.

سەبارەت بە وڵاتی بێرمە دەتوانین بودسیم وەك هۆکاری خەبات دژی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا سەیر بکەین، دیارە هۆکاری خەبات لە بێرمە لە هۆکاری خەباتی خەڵکی ئەندۆنیزیا و ڤییتنام زۆر لاوازتر بوو، بەڵام لە هەرحاڵدا بووە هۆی یەکگرتنی بێرمەییەکان و جیاکردنەوەیان لە خەڵکانی غەیرە خۆجێی[1]. لە بێرمە ژمارەیەکی زۆر هیندی دەژییان کە ئینگلیسییەکان هێنابوونیانە ئەم وڵاتە. مەزهەب دەیتوانی هۆکارێکی زۆر لەبار بێ بۆ پەرەپێدانی ناسیۆناڵیزم، هەروەکو پیاوانی ئایینی بوودایی دەیانتوانی هۆکاری بزواندن و هاندانی سەربەخۆیی خوازی و شوێنە پیرۆزەکانیشیان شوێنی پەرەپێدانی ئەم بیروبۆچوونەیان بێ.

لەم فەسڵەدا زیاتر باسی بزووتنەوە نەتەوەییەکانی دوو وڵاتی ڤییتنام و ئەندۆنیزیا دەکەین. چونکە نیوەرۆکی بزووتنەوە نەتەوایەتییەکان لەم دوو وڵاتەدا جیاواز بوو لەگەڵ بزووتنەوەی ناوچەکانی دیکە. هۆیەکی دیکە ئەوەیە کە لە هەندێك لە وڵاتانی ناوچە بزووتنەوەگەلێك کە

(1) Sarkisyan Z, E, Buddhist Bockgrounds of the Burmese Revolution, The Hague, 1965, pp.231-234.



بتوانین وەك بزووتنەوەی نەتەوەیی باسی لێ بکەین، لە ئارادا نەبوون. بۆ نموونە لە کامبۆدیا و لاوس لە دوو دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ هیچ بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی لە ئارادا نەبووە و رژێمی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسا لەم دوو وڵاتە کەسانێکی لە لوتکەی دەسەڵاتدا هێشتبووەوە کە لە چینی سوونەتی بوون. فەرەنسا بەپێچەوانەی هەڵوێستەکانی لە ڤییتنام، لەم دوو وڵاتە گۆڕانکارییەکی زۆر کەمی پێك هێنابوو.

لە کامبۆدیا، لاوس و تارادەیەك لە مالایا پێوەندی بەرژەوەندیی چینی دەسەڵاتدار لەگەڵ هێزە داگیرکەرەکانی فەرەنسا و بەریتانیا بەکردەوە ببووە کۆسپ لەسەر رێگای تێکۆشانی ناسیۆناڵیستی. پێوەندی ئاماژەپێکراو تەنیا لەبەر پاراستنی قازانجی تاکەکەسی وەك هێز و سەروەت نەبوو، بەڵکو لە روانگەی پاشاکانی کامبۆدیا و لاوس یان دەسەڵاتدارانی مالایا، بوونی هێزە داگیرکەرەکان بۆ پشتیوانی لە وڵات و خەڵکەکەی پێویست بوو. لە روانگەی میرنشینەکانی کامبۆدیا هیچ هێزێك بێجگە لە فەرەنسا ناتوانێ وڵاتەکەیان لە پەلاماری بەردەوامی ڤییتنام بپارێزێ یان لە روانگەی دەسەڵاتدارانی مالایا بێجگە لە بەریتانیا هیچ هێزێك ناتوانێ ئەوان لە بەرامبەر هێزی ئابووری چینییەکان بپارێزێ.

بارودۆخی فیلیپین بە تەواوی جیاوازبوو. ئەم وڵاتە لە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دەتوانی بڵێ یەکەم وڵاتێکە، کە بزووتنەوەی ناسیۆناڵیستی تاقیکردووەتەوە، چونکە شۆڕشی سەرنەکەوتووی خەڵکی فیلیپین دژی کۆلۆنیالیزمی ئیسپانیا، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا شێوازێکی بە تەواوی نوێی لە خەبات کردبووە ئامانج. لەگەڵ ئەمەشدا، فیلیپین هەتا کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ لەژێر دەسەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بوو و هیچ ناڕەزایەتییەك دژی بارودۆخی ئەوکات بەرێوەنەچوو. ئەم رەوشە دەتوانین بۆ دوو هۆکار بگەڕێنینەوە، یەکەم ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سەرەتای دەسەڵاتی خۆیان بەسەر فیلیپیندا، راشکاوانە رایانگەیاندبوو کە دەیانهەوێ سەربەخۆیی بەم وڵاتە ببەخشن[1]. دووەم ئەوەی کە، ئەو گرووپەی کە رێبەرایەتی بزووتنەوەی ناسیۆناڵیستی فیلیپینیان لەسەر شان بوو پێیان وابوو، ئەگەر وڵاتەکەیان لەژێر چاودێری ئەمەریکادا بێ، بەرژەوەندیی ئابوورییان بە باشترین شێوە دابین دەبێ، لە فیلیپینیشدا وەك کامبۆدیا و لاوس لە نێوان قازانجی دەسەڵاتدارانی خۆجێی و وڵاتی داگیرکەر هاوپێوەندییەکی تووند هەبوو.

(1) Saya San.

بە سەرنجدان بەم بارودۆخە ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا هەتا چەند بواری دەستراگەیشتن بە سەربەخۆیی لەبار بووە. ئەم مەسەلەیە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا و لە ڕوانگەی داگیرکەران و داگیرکراواندا جیاوازی هەبووە. یەکێك لەو هۆکارانەی کە داگیرکەرانی هێنابووە سەر ئەو باوەڕەی کە هێشتا دەتوانن ساڵانێکی دوور و درێژ لەم ناوچەیەدا حکوومەت بکەن، شێوازی کۆن و سەرنەکەوتووی خەبات دژی کۆلۆنیالیزم بوو. بێجگە لە خەباتی کۆمۆنیستەکانی ڤییتنام دژی کۆلۆنیالیزمی فەڕەنسا (١٩٣٠ و ١٩٣١)، خەباتی خەڵکی ناوچەکانی دیکە تەمەنی کورت و سەرنەکەوتوو بوو. هەندێك لەم بزووتنەوانە لەسەر بناغەی بیروباوەڕی خورافی دامەزرابوو، بۆ نموونە شۆڕشی سایاسان[1] لە وڵاتی بێرمە ساڵی ١٩٣٠-١٩٣١ بەهۆی ڕەوشی نالەباری ئابووری کە کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا سەپاندبوویان، سەری هەڵدا. سەرەڕای ئەوەی کە خەباتگێڕانی سایاسان هێرشیان کردە سەر بنکە و بارەگاکانی حکوومەتی بەریتانیا لە بێرمە، بەڵام بەهۆی کۆن بوونی کەرەستە و چەك و چۆڵ، نەیانتوانی بە ئامانجەکانیان بگەن. قەشەیەکی بوودایی بە ناوی سایاسان کە ڕێبەریی بزووتنەوەی ئاماژەپێکراوی لەسەر شان بوو، دەیویست پلەی پاشایەتی بەدەست بێنی، دیارە بە پشتبەستن بە خەباتی ئەو گوندنشینانەی کە سەرەتاییترین کەرەستەی شەڕکردنیان هەبوو و قەڵغانیان لە بەرامبەر گوللە گڕدارەکاندا ئەو باوەڕە بوو کە بە سێحر و جادو هەیانبوو.

لە ئەندۆنیزیا، خەباتگێڕانی جاوەیی و سۆماترایی کە پێڕەوییان لە خەباتی کۆمۆنیستەکان دەکرد، لە ساڵەکانی ١٩٢٦ و ١٩٢٧ بەشێوەی کاتیی بە ئامانجەکانیان گەیشتن، بەڵام ئەوان نەیانتوانی خۆیان لەگەڵ ڕاستییەکانی سەردەم بگونجێنن و خەباتەکەیان ڕێکخراوتر بکەن[2]. ڕوانگەی خەڵکی جاوە و سۆماترا لە سەرکەوتنەکان لەگەڵ هەڵوێستی ڕێبەرانی بێرمەندی ئەندۆنیزیا بە تەواوی جیاوازبوو. ڕێبەرانی ئەندۆنیزیا لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە سەربەخۆیی بەرەبەرە و بەنرخێکی یەکجار زۆر بەدەست دێ. کەسانی هەڵکەوتوو وەك ئەحمەد سوکارنۆ، محەمەد هاتا و ئەسجاهیر کە هەموویان ئۆگرییەکی توندی ئیسلامییان هەبووە و دەیانتوانی چارەنووسی ئەم وڵاتە موسڵمانە بگۆڕن، بەڵام بیریان لەو حکوومەتە دەکردەوە، کە جێگای

(1) A History of Burma, p.68.
(2) Taylor, J. G., The Social World of Batavia: European and Euroasian in Dutch Asia, London, 1984, p.100.



حکوومەتی سەرەڕۆی هۆڵەندا لە ئەندۆنیزیا بگرێتەوە و بۆ ئەم مەبەستە چەندین پڕۆگرامیان لەسەر بناغەی هەڵوێستی نوێی سیاسی داڕشت. لە ڕوانگەی ئەوانەوە خەبات تەنیا هەڵگرتنی چەك و ڕووخانی حکوومەتی زۆردار نەبوو، بەڵکو پێویستی هەر شۆڕشێك بوونی ئایدۆلۆژیا، ڕێبەری، سیاسەتی داهاتوو، پێکهێنانی ڕێکخراو و ...بوو. لە بزووتنەوەکانی ١٩٢٦-١٩٢٧ی ئەندۆنیزیا، خەڵك بەدوای هەڵوەشانەوەی تەواویماڵیایەکان، کەڵکوەرگرتنی خۆرایی لە تاکسی و کەرەستەی هاتووچۆی گشتی و پێکهێنانی حکوومەت وەك حکوومەتی کەمال ئاتاتورك بوون (شایانی باسە هەندێك پێیان وابوو کە کەسێك وەك کەمال ئاتاتورك دێ و ڕێبەریی خەڵك بەدەستەوە دەگرێ.) گۆڕانکارییەکانی ئەندۆنیزیا، بێرمە و لە هەندێك بواردا مالایا و هەروەها بزووتنەوەی ((ساکدالیست))[1]ی فیلیپین لە دەیەی ١٩٣٠ هیچ کامیان هەڕەشەیەکی جیددی دژی داگیرکەران نەبوون.

بەڵام ئەنجوومەنی ئانگ-تین[2] لە ڤییتنام کە لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە ڕێبەرایەتی دەکرا بەم جۆرە نەبوو، ئەم ئەنجوومەنە نزیك بە ساڵێك دەسەڵاتی هێزەکانی سووپای فەڕەنسای بەسەر دوو ناوچەی باکووری وڵاتی ڤییتنامی تووشی ئاڵۆزی کردبوو و بەکردەوە دەسەڵاتیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا نەمابوو. فەڕەنسا بەناردنی لێژیونی دەرەوەی خۆی بۆ ناوچە و ئاوەڵا هێشتنەوەی دەستی ئەوان بۆ سەرکوتی خەڵك توانی کۆمۆنیستەکان سەرکوت بکا، بەڵام تەنانەت لەم حاڵەتەدا کە فەڕەنسا ناچاربوو بەتەواوی هێزەوە بێتە مەیدان و بە زەحمەتێکی زۆر بەسەر کۆمۆنیستەکاندا سەرکەوێ، ژمارەیەك لە بەرپرسانی فەڕەنسی ئەم شۆڕشەیان بەبێ بناغە وەسف کرد و ئیرادەی پتەوی خەڵك کە خوازیاری سەربەخۆیی و ئازادی بوون لەبەرچاو نەدەگرت.

سەرەڕای کەمتەرخەمی داگیرکەران بەرامبەر بە سەربەخۆییخوازی خەڵکی ناوچە، دەیەی ١٩٣٠ بۆ ڕێبەرە سەرەڕۆکان قۆناغی دڵەڕاوکێ و نەبوونی ئاسایش بوو. پێ داگرتنی کەسانێك وەك دویونگ[3] دەسەڵاتداری هۆڵەندی لەسەر ئەوەی کە حکوومەتی داگیرکەری هۆڵەندا سەد ساڵی دیکە لە ئەندۆنیزیا بەردەوام دەبێ، گومانی جیددیی ئەوانی بەرامبەر بە مانەوەی

(1) Sakdalist Movement.
(2) Nghe-Tinh Soviets.
(3) Dejonge.

خۆیانی دەردەخست[1]. لە مالایا و بێرمەش داگیرکەرانی بەریتانیایی بەو راستییەیان زانی بوو کە دەبێ سەربەخۆیی ئەم ناوچەیە قبوولّ بکەن. لە کامبۆدیا و لاوس رژێمی داگیرکەر هەستی بە مەترسی نەدەکرد، بەڵام لە ڤییتنام وڵاتی فەرەنسا لەگەڵ خەباتی جیددی رووبەڕوو بوو. بەڵام لە هیچ شوێنێك کاتی هاتنەدیی سەربەخۆیی روون نەبوو. تەنیا لە فیلیپین سیاسەتوانان توانییان بەهیوا و دڵنیایی تەواوەوە تاڕادەیەك داهاتوو دەستنیشان بکەن. چونکە بەرپرسە ئەمەریکییەکان پاش پەسەندی یاسای ١٩٣٤ی کۆنگرەی ئەمەریکا بە راگەیاندنی رژێمی ((مشترك المنافع))ی فیلیپین[2]. دەرەتانی دە ساڵەیان بۆ سەربەخۆیی تەواوی ئەم وڵاتە دیاری کرد. هەر لەم قۆناغەدا سوکارنو و هاتا، رێبەرانی ئەندۆنیزیا کە لە ساڵی ١٩٣٠ ماوەی دووردرێژی زیندانییان تێپەڕ دەکرد، لە بیرەوەری خۆیاندا دەستراگەیشتن بەسەربەخۆیی وڵاتەکەیان زۆر دوور دەدی و پێیان وابوو دوای مردنی ئەوان روو دەدا[3]. ساڵەکانی نێوان دوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بە قۆناغی سەقامگیر نەبوون یان سەردەمی ئاگری ژێر خۆڵەمێش وەسف کردووە، چونکە لەم ساڵانەدا بوار بۆ خەباتی دوایی لە ناوچەدا رەخسا.

داکشانی ئابووری جیهانیش کاریگەریی بەرچاوی لەم بوارەدا هەبوو، چونکە هەرەسهێنانی شەقامی وال[4]، ناوەندی ئابووری ئەمەریکا، بووە هۆی ئەوەی کە هەناردەی ناوچە واتە قەلایی، کاوچۆ، برنج و ... پەکی بکەوێ و ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارانی ئەم پیشەیە بێکار بن و نارەزایەتی گشتی زیاتر بێ.

نەبوونی ئاسایشی سیاسی و کێشە سەرەکییەکانی ئابووری تەنیا هۆکاری ناسەقامگیری ناوچە نەبوو، بەڵکو مەسەلەگەلێك وەك چوونە سەری رێژەی حەشیمەت لە هەندێك لە ناوچەکان بەتایبەت لە جاوەی ئەندۆنیزیا و چەند بەشێك لە ڤییتنام کێشەیەکی بێ وێنەی پێك هێنابوو. چوونە سەری رێژەی حەشیمەت هەژاری و برسییەتیی بەدواوە بوو. لە ئاوریلی دەیەی ١٩٣٠ چاودێران لە ڤییتنام چەند بەڵگەیەکیان لە برسییەتی بۆ کۆمەڵ لە

(1) The Policy and Administration of the Dutch in Java, pp. 55-56.
(2) The Commonwealth of the Philippines.
(3) Nationalism and Revolution in Indonesia.
(4) Wall Street Crash.



ئوستانەکانی ئانگ ئان[1] و هایتین[2] خستۆتەڕوو کە خەڵك لەڕووی جەستەییەوە چەندە لاواز بوون[3].

نابەرامبەرییە کۆمەڵایەتییەکانیش پەرەی بە ناسەقامگیری دەدا. خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا نەتەنیا ئاشنابوون بە دەسەڵاتی ئابووریی رێبەرانی بێگانە، بەڵکو ئاگایان لەو نابەرامبەرییانەی نێوان خەڵك-کە تەنیا گرووپێکی بەستراوە و خۆفرۆش کەڵکیان لە قازانجی ئابووری وەردەگرت- هەبوو. لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠ ئەوان زیاتر لە رابردوو ئاگایان لە دنیای دەرەوەی سنوورەکانی خۆیان و هەروەها لەژێر بەستراوەیی وڵاتانی داگیرکەر و پێویستییان بە سەرچاوە سروشتی و هێزە ئینسانییەکانی ناوچە هەبوو و بەتەواوی هەستیان بە نابەرامبەری کۆمەڵایەتی، ئابووری و ... دەکرد، تەنیا چەخماخەیەك پێویست بوو هەتا ئاگری شۆڕش داگیرسێنێ و هێرشبەرانی ژاپۆنی بوونە هۆی چەخماخەیە.

(1) Nghe-An.
(2) Ha-Tinh.
(3) Duiker, W. J., The Rise of Nationalism in Vietnam 1900-1941, Ithaca, N. Y., 1976, pp. 101-102.

# فەسڵی نۆهەم

## کاریگەریی جەنگی دووەمی جیهانی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا

بەرچاوترین گۆڕانکاری سیاسی لە مێژووی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئەو گۆڕانکارییانەن کە بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانی ڕوویانداوە. هێرشی ژاپۆن بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ئەم ناوچەیەی بەتەواوی گۆڕی و سیاسەتەکانی ژاپۆن لە ساڵەکانی ١٩٤١-١٩٤٥ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای خستە قۆناغێکی نوێوە. لە ماوەی کەمتر لە چوار ساڵ، ژێرخانی کۆلۆنیالیزم سست و لاواز بوو و خەڵکی ناوچە دەستیان دایە خەبات و دارشتنی گەلاڵە بۆ داهاتووی خۆیان. سەرەکیترین مەسەلە کە بووە هۆی ئەم گۆڕانکارییە گەورەیە کاریگەریی دەروونی پەلاماری ژاپۆن بوو. ئەم کاریگەرییە ئەوەندە قوڵ بوو ئەمڕۆکە، ئەو کەسانەی ئەو قۆناغەیان تێپەڕکردووە، قۆناغی شەڕی ساردیان وەك خاڵی وەرچەرخانی گەورە لە مێژووی ناوچەدا وەسف کردووە. لە نووسراوە و بیرەوەرییە سیاسییەکانی پێوەندیدار بەم قۆناغە ڕەستەگەلی ((پێش لە شەڕ))، ((کاتی شەڕ)) و ((دوای شەڕ)) باس لە ماوەیەکی دیاریکراو و جیاواز دەکا[1]. ئەزموونەکانی شەڕ تاڕادەیەکی زۆر بووە هۆی گۆڕانکاریی گرینگ و دەربڕینی بیروڕای ناسیۆنالیستی و سەربەخۆیخوازانە و... زۆربەی ناسیۆنالیستەکان وەك هۆشی مین لە ڤییتنام، ئەحمەد سوکارنۆ لە ئەندۆنیزیا و ئانگ سان لە بێرمە- کە لەسەردەمی شەڕدا دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت- چی دیکە ئامادەنەبوون دەسەڵاتیان تەسلیمی داگیرکەرانی

(1) Silverstein, J. ed, Southeast Asia in World war II, New Haven, conn., 1966, p.147.



پێشوو بکەن، بە واتایەکی دیکە، پڕوپاگەندەی ژاپۆن لەژێر ناوی ((دەرکەوتنی نویێ بۆ ئاسیا)) و ((ئاسیا بۆ ئاسیاییەکان)) لانی کەم ڕووی ڕاستی بەخۆو گرت.

لە سەرەتای جەنگی دووەمی جیهانی لە سپتامبەری ١٩٣٩، بۆ زۆربەی خەڵکی ناوچە دەرکەوت کە تووشی شەڕ دەبن. خواردەمەنی و سەرچاوەی خاوی ناوچە بەتایبەت کانزاکان، نەوت و کاوچۆ کەرەستەی گرینگ بوون، کە نەتەنیا بۆ دەسەڵاتی داگیرکەرەکان-کەلە ئەورووپا خەریکی خەبات بوون- چارەنووسساز بوو، بەڵکو بۆ ژاپۆنی پیشەسازی کە لە ساڵی ١٩٣٧ گیرۆدەی چین ببوو، ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو.

لە ژوئەنی ١٩٤٠ بەدوای ڕووخانی فەرەنسا و هۆڵەندا لەلایەن هێزە ئەورووپاییەکان، ژمارەیەك لە ڕێبەرانی ژاپۆن خوازیاری هاتن بۆ ناوچەکە بوون، هەتا دەست بەسەر ملکی بەریتانیاییەکان و هۆڵەندییەکاندا بگرن و هەروەها سەرچاوەی پێویستی خۆیان بۆ کاروباری شەڕ دابین بکەن. پاش ڕووخانی فەرەنسا، ژاپۆن فشاری دیپلۆماتیکی خۆی بۆ سەر دەوڵەتی هیندوچین زیادکرد هەتا مولگەکان و هەڵکەوتە ستراتیژییەکان لە باکووری ڤییتنام بدەن بەدەستەوە و ڕێگای ئاوی چۆمی سوور -کە لەو ڕێگایەوە چینی میللی لەڕووی سەربازی و ئابوورییەوە دابین دەکرا- ببەستن. ئەم هەڵوێستە بووە هۆی پێکهاتنی ڕێگای بێرمە. چین لەم ڕێگایەوە پێویستییەکانی خۆی، کە دەوڵەتی ڕانگۆن بەرپرسی دابینکردنی بوو، دەگەیاندە هەرێمی یۆننان[1] لە چین. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤١ ژاپۆن بەدەستراگەیشتن بە مۆڵگەکانی دیکە لە باشووری هیندوچین و سەپاندنی فشاری زۆرتر بۆ سەر هیندی ڕۆژهەڵات و مالایا بۆ دابینکردنی بژێوی، پێگەی خۆی قایمترکرد.

لەم قۆناغەدا، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەرگری هاوپەیمانان دژی ژاپۆن تەباییەکی زیاتری بەخۆوە بینی. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چوارچێوەی دەسەڵاتی ژاپۆنی لە باکووری ڤییتنام دیاری کرد. کاتێك ژاپۆن مۆڵگە سەربازییەکانی باشووری ڤییتنامی داگیرکرد، ئەمەریکا گەمارۆی ئابووری خستە سەر ئەو وڵاتە و ناردنی نەوت و پێداویستییەکانی دیکە بۆ ئەو وڵاتەی بڕی. دانوستانێك بەمەبەستی چارەسەری ئەم کێشە بەڕێوەچوو، بەڵام لەبەر پشتیوانی هاوپەیمانان لە چین و قازانج و بەرژەوەندی ڕۆژئاوا لە ناوچەی

(1) Yunnan.

باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا، ئەم دانوستانانە بە ئاکام نەگەیشت[١]. ژاپۆن درێژەی بە ڕەوتی داگیرکەرانی خۆی دژی ناوچەکە دا. ژاپۆن لە داڕشتنی گەڵاڵەی جەنگی خۆی لە قۆناغی یەکەمدا ویستی لە ڕێگای وشکییەوە و لە ڕێگای مەنچووری پەلاماری سۆڤیەت بدا.

گەڵاڵەی ژاپۆن بۆ پێکهێنانی هەرێمێکی گەشەکردووی ڕۆژهەلاتی ئاسیا لە ناوچەدا، بریتی بوو لەو وڵاتانەی کە بە کردەوە لەگەڵ ڕێکخراوی ((مشترك المنافع))ی بەریتانیا هاوتەریب بوون. ئەم گەڵاڵەیە زۆر پاوانخوازانە بوو و لەڕووی سەربازییەوە خەرج و هەزینەیەکی زۆری هەڵدەگرت. ڕۆژی هەشتەمی دیسامبەری ١٩٤١ هێزە ژاپۆنییەکان پەلاماری ناوگانی دەریایی ئەمەریکا لە بەندەری "پرل" هەڵکەوتوو لە هەرێمی هاواییاندا. ئەوان هەروەها دامەزراوە سەربازییەکانی ئەمەریکا لە دوورگەی "الوشن"[٢] لە زەریای ئارام و دوورگەکانی فیلیپین و دامەزراوە سەربازیییەکانی بەریتانیا لە هۆنگ کۆنگ، سەنگاپوور، چەند شاری باکووری مالایا، تایلەند، حەوت شوێن لە کەنداوی سیام و مۆڵگەی ئاسمانیی تایلەند لە باکووری بانکۆکیان دایە بەر پەلاماری خۆیان. ئامانجی سەرەکی ئەم کردەوە سەربازییە ئەوەبوو ڕێگا نێونەتەوەییەکانی هاتووچۆی کەشتییەکان بخاتە ژێر چاودێرییەوە کە بەدەستبەسەرداگرتنی دوو گەرووی ستراتیژیی مالاکا و سوندا بە ئاکامی دەگەیشت و دەستراگەیشتن بە قەلایی، نەوت، برنجی مالایا، بێرمە، ئەندۆنیزیای مسۆگەر دەکرد. ئامانجی دیکە کە بۆ ژاپۆن چارەنووسساز بوو دەستراگەیشتن بەو شوێنانە بوو هەتا بتوانێ ئوسترالیا و هیندستان بخاتە مەترسییەوە و ڕێگای ناردنی یارمەتیی چینی میللی ببەستێ.

تایلەند لە یەکەمین سەعاتەکانی پەلاماری ژاپۆن خۆی بەدەستەوەدا[٣] (لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا سەبارەت بە تایلەند دەڵێن کە خۆبەدەستەوە دەرە و بەهەربایەك دەچەمێتەوە.) هێزی دەریایی بەریتانیا و هۆڵەندا بەرگرییان کرد بەڵام بەهۆی زاڵبوونی هێزە ژاپۆنییەکان و بایەخدانی هاوپەیمانان بە ئەورووپا نەیانتوانی هێزی پێویست بۆ ئەم ناوچەیە بنێرن، هەربۆیە نەیانتوانی لە بەرامبەر ژاپۆندا خۆڕاگرن. چوار مانگی بەردەوام ڕۆژنامە جیهانییەکان ڕاپۆرتی

(1) Jones, F. C., JaPan’s New Orer in East Asia 1937-1945, London, 1974, pp.11-12.
(2) Aleution Islands.
(3) McCoy, A. ed., Southeast Asia Under Japanese OccPation, New Haven, Coon, 1984, p.152.



هەرەسهێنانی شارە گەورەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیایان بەدەستی هێزە ژاپۆنییەکان بڵاودەکردەوە (هۆنگ کۆنگ لە ٢٥ی دیسامبەری ١٩٤١، مانیل لە ٢ی ژانویەی ١٩٤٢، کوالالامپور لە ١١ی ژانویەی ١٩٤٢، سەنگاپوور لە ١٥ی فەوریەی ١٩٤٢، ڕانگون (یانگون) لە ٧ی مارسی ١٩٤٢ و تەواوی ناوچەکانی هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندا لە ٩ی مارسی ١٩٤٢). لە کۆتایی ئاوریلی ١٩٤٢، لە ماوەی شەش مانگدا هێزە ڕۆژئاواییەکان کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ببوونە ئەربابی ناوچەکە، دەرکران. تەنیا دەوڵەتی خۆرێکخەری ویشی فەڕەنسا[١] بوو کە لەگەڵ ژاپۆن هاوکاریی دەکرد و بەڕواڵەت بەشێوەی هاوبەش درێژەیان بە حکوومەتی خۆیان لە ناوچەی هیندوچین دەدا (تەنیا ئاڵای فەڕەنسا بەسەر بینا دەوڵەتییەکانی هیندوچین دەشەکایەوە، بەڵام بەکردەوە کۆنتڕۆڵی تەواو بەدەستی ژاپۆنییەکانەوە بوو و فەڕەنسا تەنیا فەرمانبەرێکی گوێڕایەڵ بوو.)

هێرشی ژاپۆن بۆ ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ئەفسانەی لە شکان نەهاتوویی ڕۆژئاواییەکانی تێکشکاند. ئەم ڕووداوە بۆ خۆی شۆڕشێکی گرینگ بوو، شۆڕشێك لە زەیەن و هەستدا، ئەوەی کە دەتوانن بەسەربەخۆیی بگەن و بیپارێزن. گەشەی ئیمپڕاتۆری ژاپۆن، لاوازی هێزە ڕۆژئاواییەکانی ئاشکرا کرد. خێرایی کردەوە و توانایی ژاپۆن خەڵکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای لە پەراوێزی، تەسلیم بوون و چارەنووسی نادیار ڕزگارکرد و فێری کردن کە ئەوانیش دەتوانن داهاتووی خۆیان بەجیا لە کۆلۆنیالێزم و ڕژێمی داگیرکەر دیاری بکەن. ئەو خەڵکەی کە ماوەیەکی دوورودرێژ لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی داگیرکەردا بوون بە یەکجاری هاتنە گۆڕەپانی سیاسەتی نێونەتەوەییەوە.

### ئاسەواری هاوبەشی کاریگەریی ژاپۆن لە ناوچەدا

هەرچەندە کاریگەریی هێرشی ژاپۆن لە وڵاتانی ناوچە جیاوازە، بەڵام دەتوانین ئاماژە بە هەندێك ئاسەواری هاوبەش بکەین:

١- ژاپۆن هانی پێکهێنانی هێزە سەربازییەکان یان هێزە چەکدارە خۆجێیەکانی دەدا، کە ناوەندی سەرەکی خەباتی نەتەوەخوازانە و دژی هێزە داگیرکەرەکان بوون و پشتیوانی لێدەکردن. بۆ نموونە پێکهێنانی سووپای پەتا (سووپای بچووکی ئەندۆنیزیا) بووە هۆی ئەوەی

(1) The vichy Government.

کە ئەم خەڵکە ببنە خاوەن ڕێکخراوێکی سەربازی و لەو ڕێگایەوە سەرکەوتن بۆ خەڵکی خۆیان بەدەست بێنن.

٢- حکوومەت یان دەزگای سەربازی ژاپۆن بواری لەباری بۆ بەشداری سووپا لە مەسەلە سیاسییەکانی وڵاتانی ناوچە پاش سەربەخۆیی ڕەخساند، بەجۆرێك لە سێ وڵاتی بێرمە، تایلەند و ئەندۆنیزیا سووپا هێشتا ڕۆڵی چارەنووسسازی هەیە. لە وڵاتی فیلیپینیش سووپا هێزێکە کە دەبێ بوونی ئەو لە هەموو مەسەلە سیاسییەکاندا لەبەرچاو بگیرێ.

٣- بووژانەوەی نەریتی سەربازیی کۆن و کۆتایی ئەفسانەی لەشکاننەهاتوویی ڕۆژئاوا دوو میراتی بەجێ ماوە لە هێرشی ژاپۆن. لە ئەندۆنیزیا بووژانەوەی نەریتی سەربازی کۆن بە تەواوی دیارو بەرچاو بوو.

٤- ژاپۆن بە داگیرکردنی ناوچە، ئەزموونی پڕ بایەخی بۆ ڕێبەرانی ناوچە بەدیاری هێنا و ئەوانی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ داگیرکەرانی پێشوو کە دەیانویست دەسەڵاتی لەدەست چوویان ببووژێننەوە ئامادە کرد.

٥- سەرەڕای گۆڕانکاری هزری کە لە ئاستی ڕێبەریدا پێك هات، چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگاش گۆڕانی بەسەرداهات و پاش پێکهێنانی سووپای کرێکاری و بەشداری لە دروستکردنی ڕێگای ئاسنی بێرمە-تایلەند ڕەوشی کۆمەلایەتی، سیاسی و ئابووریی ناوچەی بەتەواوی گۆڕی.

٦- پشتیوانی ژاپۆن لە ناسیۆنالیزمی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، مەسەلەیەك بوو کە سەرنجی خەڵکی ناوچەی ڕاکێشا. لەڕوانگەی ڕێبەرانی ناوچەکە، ناسیۆنالیزم نەتەنیا دەرکەوتنی خواستی دەروونیی ئەوان بوو، بەڵکو ڕەوایی سیاسی ئەوان لە سیستەمی نێونەتەوەیشی بەدواوە بوو. کامیە کاتسیۆ چیرۆ[1]، یەکێك لە ڕەخنەگرانی فراوانخوازیی ژاپۆن لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، وتوویەتی تراژیدیای گەورەی ژاپۆن، نەفرەتی ئەو وڵاتە لە وڵاتانی دیکەی ئاسیایە کە بووە هۆی مۆدێرن کردنەوەی خێرایی ژاپۆن لە چاو وڵاتانی دیکەی دراوسێی. لەگەڵ ئەوەی شەڕی ژاپۆن کۆتایی بە ئەفسانەی لەشکاننەهاتوویی ڕۆژئاوا و ڕێگا و شێوازی سیاسی و داگیرکەرانەی ئەو هێنا، بەڵام وای لە هەندێك لە بەرپرسانی حکوومەتی ژاپۆن کرد هەمان سوکایەتی ڕۆژئاواییەکان بەرامبەر بە خەڵکی ناوچە نیشان بدەن.

(1) Kamieh Katsio Chiro.



٧- هێرشی ژاپۆن لەڕووی ئابوورییەوە ئاسەواری ڕووخێنەری هەبوو. هاتنەخوارەوەی هاوردە بەهۆی نوقم بوونی کەشتییەکانی ژاپۆن لەلایەن ژێردەریاییەکانی هاوپەیمانان، بێکاری بەکۆمەڵی کرێکارانی کێڵگەکان، کۆنترۆڵی چاندنی برنج و بەرهەمەکانی دیکەی خواردەمەنی لەلایەن ژاپۆن و کەمبوونی برنج لە ناوچە ئەو ئاسەوارانەن، کە دەتوانین ئاماژەی پێ بکەین. هەروەها کاری تێکدەرانە لە کانگاکانی قەلآیی و ئەو ناوچانەی نەوتی لێ بوون، بۆردومانی ڕێگا و بانەکان، پڕدەکان و هێڵەکانی ڕێگای ئاسن، کاری زۆرەملێ لە ئۆردوگاکان و بارودۆخی خراپی ئابووری، هەموویان هۆکاری ناڕەزایەتی خەڵکیان پێك دەهێنا.

هاوکات لەگەڵ کێشەکانی سەرەوە، ڕەوشی سیاسی و سەربازیی ژاپۆنیش بەشێوەی ناڕاستەوخۆ ڕێگای بۆ گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ناوچە خۆش دەکرد. ژاپۆن بەهیوای ئەوەی کە شەڕی ئەورووپا لە ساڵی ١٩٤٢ کۆتایی پێ دێ، پەلاماری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیایدا، بەڵام لە ناوەڕاستی ١٩٤٣ بارودۆخەکە بە زیانی ژاپۆن گۆڕانی بەسەرداهات. ژاپۆنییەکان لە داگیرکردنی هیندوستان سەرکەوتوو نەبوون و بە تێکشکانی کەشتییەکانی ژاپۆن لە شەڕی میدوی[1] ڕێگا بۆ عەمەلییاتی ئەمەریکا لە هەرێمی باشووری ناوچەی پاسیفیك خۆش بوو. ژاپۆن بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی و ڕاکێشانی پشتیوانی خەڵکی خۆجێیی ناوچە هەوڵی زۆریدا، بۆ نموونە هەندێك ئیمتیازی سیاسی بە ناسیۆنالیستەکانی ناوچە و پێکهێنانی حکوومەتێکی نیمچە سەربەخۆ لە بێرمە و فیلیپیندا. ژاپۆن هەروەها هاتە سەر ئەو بڕوایە هەندێك لە هەرێمەکانی باکووری مالایا و هەرێمی ((شان نشین))[2]ی بێرمە تەحویلی تایلەند بدا. لە ئووتی ١٩٤٥ ژاپۆن بۆ خۆی کۆنفراسی سەربەخۆیی ئەندۆنیزیای بەڕێوەبرد. ئەم کۆنفرانسە لە مادورا[3] (لە جاوە) پێك هات و دەست بەجێ دوای ئەو کۆنفرانسە ئەندۆنیزیا وەك یەکەمین ناوچە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند.

لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٤ کە هێزە بەریتانیاییەکان چوونە باکووری بێرمە و ئەمەریکا بۆ داگیرکردنی فیلیپین کەوتە خۆی، فشار و کێشەکانی ژاپۆن زیادی کرد. بۆردومانی بەردەوامی هێڵەکانی گەیاندنی ژاپۆن لەلایەن هاوپەیمانانەوە بووە هۆی بەهێزبوونی بزووتنەوەی

(1) Battle of Midway.
(2) Shan States.
(3) Madura.

بەرگری لە بێرمە، تایلەند، هیندوچین و مالایا و بە پشتیوانی سەربازی و ماڵیی ئەمەریکا و بەریتانیا زیاتر بەهێزبوون[1]. لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥، ژاپۆن بە داگیرکردنی دووبارەی بێرمە بۆ پاراستنی پێگەی خۆی کەوتەخۆ و دەسەڵاتی زیاتری بە ناسیۆنالیستەکانی ناوچە بەخشی. بۆ ژاپۆن، کە بە کردەوە دۆڕاوی شەڕ لە زەریای ئارام بوو، پاراستنی دەستکەوتەکانی لە ناوچە بۆ ئەو چارەنووسساز بوو.

ژاپۆن بەو سەرکەوتنانەی بەدەستی هێنابوو، تەنانەت لە ژوئیەی ١٩٤٥یش هیچ کەس چاوەڕوانی کۆتایی شەڕ نەبوو، بەڵام لە ڕۆژەکانی شەشەم و نۆیەمی ئووتی ١٩٤٥ دوو بۆمبی ناوەکیی ئەمەریکا لە دوو شاری گەورەی ژاپۆن، واتە هێروشیما و ناکازاکی، هاتنەخوارێ و دوای ئەو لە چواردەهەمی هەمان مانگ هیروهنیۆ[2]، ئیمپراتۆری پێشووی ژاپۆن، لە پەیامی ڕادیۆییدا خۆبەدەستەوەدانی بێ ئەم لاو ئەو لای ژاپۆنی ڕاگەیاند. هیچ کەس و بەتایبەت بەرپرسانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان چاوەڕوانی ئەم هەواڵە نەبوون. مەسەلەکە ئەمە نەبوو کە ئەوان (ڕژێمە داگیرکەرەکان) لەڕووی سەربازی و ئیدارییەوە ئامادەگی پێویستیان نەبوو، بەڵکو ئەوان ئیرادەی قایم و پتەوی خەڵکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و پێداگری ئەوان بۆ هێنانەدی سەربەخۆییان بۆ دەرنەکەوتبوو. بێجگە لە ئەمەریکا کە بەڵێنی سەربەخۆیی فیلیپینی دابوو وڵاتە زلهێزەکانی دیکە بیریان لە گەڕانەوەی ناوچە بۆ دۆخی پێشوو دەکردەوە. سەرەڕای ئەمەش ئەوان بەهۆی ئەو زیانانەی کە لە ئاکامی شەڕەوە لێیان کەوتبوو بۆ بووژانەوەی ئابووری خۆیان خوازیاری هەڵوەشانەوەی ئیمتیازگەلێك بوون کە لە دوو دەیەی ٢٠ و ٣٠ی سەدەی بیستەم بە خەڵکی ناوچە درابوو. بوار بۆ پێکدادانی توندوتیژ لە نێوان ناسیۆنالیزمی ناوچە و داگیرکەران ئامادەبوو.

بەهەر حاڵ دەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین کە جەنگی دووەمی جیهانی خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی گۆڕأنکارییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی وینستۆن چرچیل و شارل دوگوڵ، گۆڕانکارییەکانی قۆناغی شەڕ بواری وای ڕەخساند، کە گەڕانەوە بۆ قۆناغی پێش شەڕ ئیمکانی نەبوو. هێرشی ژاپۆن هێرشێکی سەربازی نەبوو، بەڵکو تەقینەوەیەکی سیاسی بوو کە بە خەڵکی ناوچەی سەڵماند دەتوانن داگیرکەران لە ناوچە وەدەربنێن. شکاندنی تابۆی زاڵبوونی

(1) Tragrer, F. N. Burma, From Kingdom to Republic, New York, 1966, p.188.
(2) Hirohito.



ئەورووپاییەکان تەنانەت بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕی ناسیۆنالیستییان هەبوو، کاریگەری گرینگی بەجێهێشت. ژاپۆن بە کوشتاری چینییە کۆچبەرەکان و جینایەتی لەڕادەبەردە بەرامبەر بە خەڵکی ماڵی وای کرد کە منداڵانی خاك واتە خەڵکی ماڵی، بە پلەو پایەیەکی نوێ بگەن. هەروەها ژاپۆن لە ئەندۆنیزیا بووە هۆی پێکهاتنی سووپایەکی سەربەخۆ لە نەتەوەیەکی فرەچەشن و سووپای بێرمەی، کە لە سەرەتای پەلاماری ژاپۆن نەدەگەیشتە چەند هەزار کەس، کردە سووپایەکی سێ هەزار کەسی. لە تایلەند کۆڵەکەکانی حکوومەت قایمتر بوون، لە هیندوچین بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی گیانێکی نوێی وەبەرهاتەوە و بووە هۆی گەشەی بێ وێنەی بزووتنەوەی هۆشی مین کە بەکردەوە داوای حکوومەتی ڤییتنامی دەکرد، لە لاوس، خەڵکی لە خەونی چەند سەد ساڵە ڕاپەڕین، لە کامبۆدیا گۆڕانکاری بەرچاو ڕوویدا، بەجۆرێك کەمبۆدیای تەریك کەوتووش تێکەڵ بە ڕەوتە ناسیۆنالیستییەکانی ناوچە بوو. پێکهێنانی حکوومەتە دەستکردەکان وەك حکوومەتی بائوماو[1] لە بێرمە و بائودای[2] لە ڤییتنام بووە هۆی خێراتربوونی ڕەوتە بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازەکان.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە سەدەی هەژدەهەم خاڵی وەرچەرخان لە مێژووی ناوچە بوو، بەشێوەیەك گرینگییەکەی بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بە تەواوی هەست پێ دەکرا. جەنگی دووەمی جیهانی، هێرشی ژاپۆن و شکستی ئەو وڵاتە لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەتوانین وەك کۆتایی ئەم قۆناغە سەیر بکەین.

(1) Bao Maw.
(2) Bao Dai.

# فەسڵی دەیەم

## باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە سیستەمی نوێی جیهانیدا

### بارودۆخی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵاتانی ناوچە پاش جەنگی دووەمی جیهانی

دەتوانین سەردەمی دوای شەڕ بە پێنج قۆناغ دابەش بکەین:

قۆناغی یەکەم بە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی دەست پێ دەکات و لە زۆربەی وڵاتەکان لە ساڵی ١٩٥٤ کۆتایی پێ دێ. لەم قۆناغەدا شاهیدی خەباتی سەرکەوتووانەی خەڵکی بێرمە (١٩٤٨)، ئەندۆنیزیا (١٩٤٩)، کامبۆدیا، لاوس، ڤییتنام (١٩٥٤) و فیلیپین بووین کە بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی نەتەوەیی تێ دەکۆشان. هەروەها شاهیدی پێگەیشتنی سیاسی خەڵکی (مالی)ن کە لە ساڵی ١٩٥٧ سەربەخۆ بوون. لەم قۆناغەدا بزووتنەوە کۆمۆنیستەکان دژی حکوومەتەکان تووشی قەیرانی سەرەکی بوون و ناسیۆنالیستەکان و کۆمۆنیستەکان لە زۆربەی وڵاتەکان تووشی شەڕ و پێکدادانی بەربڵاوبوون. ڕێبەرایەتی وڵاتە جۆراوجۆرەکان لەم قۆناغەدا لەگەڵ کێشەی گەورەی ئاوەدانکردنەوەی پاش شەڕ و کێشە ئابوورییەکان بەرەوڕوو بوون و لیبراوانە بۆ پێکهێنانی ڕێکخستنی نوێی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری لە وڵاتەکەیان تێدەکۆشان. نۆژەنکردنەوەی ئابووری و پاشان گەشانەوەی ئابووریی کۆریا ١٩٥٠-١٩٥٣ بووە هۆی گەشەی ئابووری ناوچەکە، بەڵام شەڕە نێوخۆییەکان، دووبەرەکی سیاسی و شێوازی نوێی دەستێوەردانی ڕۆژئاوا لە ناوچە، بووە هۆی ئەوەی کە بزووتنەوەی ڕوو لە گەشە، بە لەسەرەخۆیی بەرەوپێش بڕوا.

قۆناغی دووەم لە کۆتایی شەڕی کۆریا، واتە نزیکەی ساڵی ١٩٥٤ دەست پێ دەکا. ئەم قۆناغە کە بە توندی کەوتبووە ژێر کاریگەریی سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە چین (١٩٤٩) هاوکاتە لەگەڵ کۆنفرانسی ژنێڤ (١٩٥٤)،کۆتایی یەکەمین شەڕی هیندوچین لەگەڵ فەڕەنسا و شکستی فەڕەنسییەکان لە شەڕی دین بین فو و پێکهاتنی ڕێکخراوی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا



(سیتو). ئەم قۆناغە لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٦٠ هاوکات لەگەڵ پەرەئەستاندنی شەڕ لە ناوچەی هیندوچین کۆتایی پێ دێ. خاڵی بەرچاوی ئەم قۆناغە بریتییە لە هێرش و فراوانخوازی نوێ لە ناوچە (لەوانە سیاسی، دەروونی و ڕاگەیاندن و هتد...) کە ڕۆژئاوا هۆکاری سەرەکی ئەو ڕەوشە بوو و هەروەها ترس و نیگەرانی گەمارۆی ناوچە لەلایەن کۆماری گەلی چین و یەکیەتی سۆڤییەت (پێشوو). قۆناغی دووەم، قۆناغی کێبەڕکێی توندی وڵاتە زلهێزەکان لە ناوچەیە، کاتێك وڵاتانی تایلەند، ڤییتنامی باکوور و فیلیپین لە پێوەندی لەگەڵ ئەم کێبەڕکێیە هەڵوێستیان گرت، هەر یەکە پشتیوانی لەلایەنێکی دەکرد، وڵاتانی دیکەی وەك ئەندۆنیزیا و کامبۆدیا بە بزووتنەوەی بێ لایەن (عدم تعهد)[1] پەیوەست بوو. دوو بەرەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا یارمەتی بەرچاویان بە هاوپەیمانانی سەربازی و ئابووری خۆیان دەدا.

١- ئەم بزووتنەوەیە لە ساڵی ١٩٥٥ لە کۆنفراسی باندونگی ئەندۆنیزیا بناغەکەی دانرا.

لە دارِشتنی ڕێبازی سیاسی ڕێنوێنییان دەکردن. بۆ نموونە پاش ئەوەی ژاپۆن بازاری چینی- کە سەرچاوەی کەرەستەی خاوی ئەو وڵاتە بوو- لەدەستدا، لەسەر ڕاسپاردەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پێوەندی ئابووریی خۆی لەگەڵ وڵاتانی ناوچە بەرەو باشی برد (یارمەتی ئابووری و تەکنیکیی ژاپۆن بە سەنگاپوور، مالیزیا، تایلەند و هتد... ڕەنگدانەوەی ئەم ڕاسپاردەیە بوو)[1].

قۆناغی سێهەم کە قۆناغی گەشانەوەی ناوچە بوو ساڵەکانی ١٩٦٥-١٩٧٥ی لەخۆ دەگرت، واتە قۆناغی دووەمین شەڕی هیندوچین. لەم قۆناغەدا ئەو سیستەمانەی کە لەکاتی سەربەخۆییدا بە هیوایەکی زۆرەوە شکڵیان گرتبوو کەوتبوونە ژێر توندترین فشارەوە. بۆ نموونە سیستەمی دیموکراسی ڕێنوێنیکراوی ئەحمەد سوکارنۆ، باوکی نەتەوەی ئەندۆنیزیا، مزگێنی سەرهەڵدانی سیستەمێکی نوێی لە جیهانی سێهەم دەدا و سیستەمەکانی دیکەی وەك خۆی جێگایان بۆ ڕژێمە بەهێزەکان خۆشکرد، ڕژێم گەلێك کە بە مستی پۆڵایین پەرەپێدانی ئابوورییان هێنایەدی[2].

شەڕ و پێکدادان لە ڤییتنام، کامبۆدیا و لاوس توندتر بوو و ئاسەوارەکەی تەواوی ناوچەی گرتەوە. لەم قۆناغەدا دەستێوەردانە سەربازی و سیاسییەکانی ئەمەریکا لە ناوچە

---

(1) Guy, Pauker J. Diversity and Development in Southeast Asia: The Coming Decad, Cambridge Univ-Press, 1988, pp. 91-92.

(٢) سەرنج بدەن: ((حکومەت آمرانه و رشد سریع اقتصادی: تجربة آسیا))، مجله اطلاعات سیاسی- اقتصادی، ش٥١ و ٥٢، ١٣٧٠، ص١٤-١٨.

پەرەی گرت و چین و سۆڤییەتیش بۆ بەربەرەکانیٚ لەگەڵ ئەمەریکا پەرەیان بە دەستێوەردانەکانی خۆیاندا. دەستێوەردانی ئەمەریکا لەناو چەقەیرانی خولْقاندو بەکردەوە بووە هۆی ناسەقامگیری ناوچەکە. یارمەتییە ئابوورییەکانی ڕۆژئاوا بە سەرمایەداری ناوچە و بە واتایەکی دیکە خێراییەکی زۆرتری بە سیاسەتی ئاوەدانکردنی دەرگاکان بەخشی و بووە هۆی گەشەی گرووپێکی تایبەت کە نوخبەی سیاسی-ئابووری ناوچەبوون و ئاڵۆزی سیاسی زۆری پێکهێنا.

قۆناغی چوارەم بە پاشەکشەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کۆتایی شەڕی هیندوچین لە سەرەتای ١٩٧٠ دەستی پێکرد، واتە بە ئیمزای ڕێککەوتننامەی پاریسی (١٩٧٣) لە نێوان هێنری کیسینجر، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا و لی دوك تو، نوێنەری ڤییتنامی باکوور. ئەم قۆناغە بە سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە ڤییتنام، کامبۆدیا و لاوس (لە ساڵی ١٩٧٥) بەوپەڕی خۆی گەیشت[1]. گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ئەم قۆناغە بووە هۆی ئەوەی کە بیٚرمە لە تەریك کەوتوویی و پەراوێزخراوی بێتەدەر و وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە ساڵی ١٩٦٧ گەیشتنە پەیمانێکی بەڕواڵەت ئابووری، بەڵام بەکردەوە سیاسی بەناوی یەکیەتی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا[2]. کۆتایی خەباتی کۆمۆنیستەکان دژی حکوومەتەکانی بەستراوە بە ئەمەریکا، کێشە و ململانێی سەربازی نێوان ڕژێمە بەناو مارکسیستەکانی لێکەوتەوە. بەم جۆرە ڤییتنام پەلاماری کامبۆدیایدا و ((چین))یش لە کردەوەیەکی تۆڵەئەستێنانەدا پەلاماری ڤییتنامی دا هەتا بە وتەی دنگ شیائو پینگ[3]، ڕێبەری چین، دەرسێکی لەبیرنەکراو بە ڤییتنام بدا.

لەگەڵ ئەمەشدا، کێشەی سەرەکی ڕێبەرانی ناوچە زۆرتر نێوخۆیی و ناوچەیی بوون. ژمارەیەرکی بەرچاو لە وڵاتەکان لە قۆناغی چوارەمدا لەگەڵ گۆڕانکاری سیاسی بەرەو ڕووبوون. تایلەند لە ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٧ قۆناغی دیموکراسی تاقیکردەوە و[4] لە کەمبۆدیا لە

(1) Harrison, James, P. the Endless war, fifty years of Straggle in Vietnam, 1982, MaCmillan, pp.79-80.
(2) Association of Southeast Asian Nation (ASEAN).
(3) Deng Xiaoping.
(٤) سەرنج بدەنە: محمد ربیع بن محمد ابراهیم، سفینة سلیمانی (سفرنامه سفیر ایران بەسیام)، تصحیح، عباس فاروقی، انتشارات دانشگاه تهران، ١٣٥٦، ص٢٧٩-٢٨١.



ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٩ قۆناغی ڕەشی خێمێرە سوورەکان بوو. لاوس لە ساڵی ١٩٧٥ شاهیدی شۆڕشی کۆمۆنیستی و فیلیپین لە ساڵی ١٩٧٢-١٩٨٦ شاهیدی حکوومەتی سەربازی و دیکتاتۆری فێردیناند مارکۆس بوو. مالیزیا لە ساڵی ١٩٦٩-١٩٧١ قۆناغی دڵەڕاوکێی تێپەڕکرد و لە ئەندۆنیزیا لە ساڵی ١٩٦٥-١٩٦٦ قۆناغی شۆڕش دژی سورکارنۆ و پێکهێنانی حکوومەتی سەربازی ژنراڵ سوهارتۆ بوو.

قۆناغی پێنجەم لە پەلاماری ڤییتنام بۆ کامبۆدیا (لە دیسامبەری ١٩٧٨) دەستی پێکرد واتە بە ڕووخانی حکوومەتی ((پل پات))[1]ی خوێنمژ کە جێگری هنگ سامرین[2] و دیاریکراوی ڤییتنام بوو. ئەم قۆناغە کە بە چاخی کامبۆدیا ناسراوە لە ساڵی ١٩٨٩ بە دەرچوونی سەربازە ڤییتنامییەکان لە کامبۆدیا و هەڵوێستی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی دیموکراتیك لەو وڵاتەدا کۆتایی پیٚ هات. لەم قۆناغەدا شاهیدی یەك ریزی ((ئاسیٚ ئان))، کێشەی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری وڵاتانی هیندوچین، بزووتنەوەی دیموکراسی و سەرکوتکردنی لە بیٚرمە و زیندانیکرانی خاتوو ئانگ سان سوکی[3]- براوەی هەڵبژاردنی ١٩٩٠ و وەرگری خەڵاتی ئاشتی نۆبیلن.

## سەربەخۆیی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا

وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە قۆناغی پڕ لە هەوراز و نشێو و دژواری کۆلۆنیالیزم و داگیرکەرانی وڵاتەکانیان تەجرووبە کردبوو، بۆیان دەرکەوتبوو کە جیهانی پاش شەڕ جیهانێکی پڕ لە کێشە و ئاڵۆزییە. بە کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی گۆڕانکارییە سیاسییەکان کە بەهۆی دژایەتی لەگەڵ کۆلۆنیالیزم پێك هاتبوون لە زۆربەی حاڵەتدا پێشی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی، ئابووری و فەرهەنگییەکان کەوت و چوارچێوە نێونەتەوەییەکان بە تەواوی گۆڕانی بەسەرداهات.

لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٥-١٩٦٠ وڵاتانی ئەم ناوچەیە لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە بۆ وەدەرنانی هێزە داگیرکەرەکان تێکۆشان. بۆ نموونە، وڵاتی بیٚرمە لە ساڵی ١٩٤٧ واتە ساڵێك

(1 ) Pol Pot.
(2) Heng Samtin.
(3) Aung San Suu Kyi.

پێش رزگاری لە دەسەڵاتی بەریتانیا بڕیاریدا بە وڵاتانی ((مشترك المنافع)) پەیوەست نەبێ، سەرەڕای ئەمەش بێرمە ماوەیەکی دیکە لەبەرەی مالیی بەریتانیا، بەرەی ستێرلینگ[1] مایەوە. دژکردەوەی دیکە وەك خەباتی درێژخایەن و دژی کۆلۆنیالیزم بوو کە دەتوانین ئاماژە بە هەندێکیان بکەین: شەڕی نێوان ئەندۆنیزیا و هۆڵەندا پاش جەنگی دووەمی جیهانی سێ ساڵی دیکە بەردەوام بوو و سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٤٩ بە سەربەخۆیی ئەندۆنیزیا کۆتایی پێ هات. شەڕی خوێناوی نێوان ڤییتنام و فەرەنسا ٩ ساڵ درێژەی کێشا و سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٥٤ کۆمۆنیستەکان دەستیان بەسەر نیوەی ئەم وڵاتەدا گرت. لە وڵاتانی دیکە وەك مالایا، لاوس و کامبۆدیا پێوەندی دەوڵەتی خۆجێی و دەوڵەتی داگیرکەری پێشوو دۆستانە بوو. لە فیلیپین پێوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ ئەو وڵاتە بەهۆی هەندێك ڕێککەوتننامە و پەیمانی سەربازی هاوسەنگ کرابوو.

سیاسەتە جیهانییەکان پاش جەنگی دووەمی جیهانی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای ناچارکرد کە لە دوو ڕێگاچارە، بێ لایەن مانەوەیان پەیوەست بوون بە بەرەی ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا یەکێك هەڵبژێرن. لە ساڵی ١٩٥٤ دوو وڵاتی تایلەند و فیلیپین پەیوەست بوون بە ڕێکخراوی پەیمانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (ستیو). گەلالەی ڕێکخراوی ناوبراو لەلایەن ئەمەریکاوە دارێژرابوو و ئامانج لە پێکهێنانی، خەبات دژی کۆمۆنیزم لە ئاستی ناوچەییدا بوو. فیلیپین و تایلەند تەنیا وڵاتانی ناوچە بوون کە بە (ستیو) پەیوەست ببوون. کۆماری دیموکراتیکی ڤییتنام (ڤییتنامی باکوور) لە هەڵوێستی سیاسی خۆیدا یەکگرتن لەگەڵ دوو وڵاتی یەکیەتی سۆڤییەتی (پێشوو) و کۆماری گەلی چینی لە بەرچاوبوو.

زۆربەی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هاوڕێ لەگەڵ وڵاتانی دیکە کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمدا بوو، لە بەرامبەر گۆڕانکارییە سیاسییە نێو نەتەوەییەکان ڕێگاچارەیەکی بێ لایەنییان گرتە پێش. سیاسەتی بێ لایەن بوون، پاش بەڕێوەچوونی کۆنفرانسی باندونگ لە ئەندۆنیزیا لە ساڵی ١٩٥٥ کە ڕێبەرگەلێك وەك سوکارنۆ، نو[2]، نەهرۆ و جوئان لای[3] پێکیان هینابوو، دۆخی گشتیی بەخۆوە گرت. سێ وڵاتی بێرمە، ئەندۆنیزیا و

(1) Sterling bloc..
(2) Nu.
(3) Zhou En-Lai.



کامبۆدیا بەشێوەی چالاك لایەنگیرییان لە سیاسەتی بێ لایەنەکان دەکرد. سیاسەتگەلێك کە وەزیری کاروباری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە غەیرە ئەخلاقی ناوی دەبرد. لە لاوس و ڤییتنام خەڵکی بەهۆی کێشە نێوخۆیی و دەرەوەییەکانەوە تووشی شەڕهاتن کە زیانێکی گەورەی بەدواوە بوو. گۆڕانکاری گرینگی دیکە، دامەزراندنی پێوەندی سەرلەنوێی نێوان وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بوو. دیارە لە هەندێك حاڵەتدا سەربەخۆیی بووە هۆی هاتنە ئارای سەرلەنوێی ناکۆکی و رق و قینە کۆنەکان کە پێش لە قۆناغی کۆلۆنیالیزم لەناوچەدابوو. ئەم ناکۆکییانە زۆرجار لە دیاریکردنی ئەو سنوورانەی کە داگیرکەران بەسەر ناوچەیان سەپاندبوو، سەرچاوەی دەگرت. داخوازی فیلیپین سەبارەت بە هەرێمی سەبا (مالیزیا) هاوکات بوو لەگەڵ داخوازی کامبۆدیا بەرامبەر بە چەند بەشێك لە ڤییتنام و داخوازی تایلەند لە پێوەندی لەگەڵ ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوای کامبۆدیا. هەروەها شەڕی چەکدارانەی سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ بەناوی سیاسەتی بەربەرەکانی (کۆنفرانتاسی)[1] کە لە نێوان مالیزیا و ئەندۆنیزیا ڕوویدا، بەهۆی کێشەی زەوییەوە بوو.

لە دەیەی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ سیاسەتی ڤییتنام و تایلەند سەبارەت بە لاوس لەژێر کاریگەریی ڕابردووی دوو وڵاتدا بوو. ڤییتنام بۆ پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژئاوای خۆی هەمان ئەو هەوڵانەی دەدا کە لە سەدەی نۆزدەهەم کردبووی و زیندووکردنەوەی دەسەڵاتی بەسەر دوو وڵاتی لاوس و کامبۆدیا لە داستای ئامانجە پێشووەکانی ئەم وڵاتەدا بووە[2]. دوای ساڵی ١٩٤٩ بە یەکگرتن و بەهێزبوونی کۆمۆنیزم لە کۆماری گەلی چین ئەم وڵاتە سەرلەنوێ سەرنجی وڵاتانی ناوچەی ڕاکێشا. ئەم سەرنجە تەنیا وڵاتانی وەك لاوس و بێرمە کە سنووری هاوبەشیان لەگەڵ چین بوو نەدەگرتەوە، بەڵکو سەرتاسەری ناوچەی لەخۆدەگرت.

لە دەیەی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ هاتنی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ گۆڕەپانی سیاسەتی نێونەتەوەیی هاوکات بوو لەگەڵ هاتنی بەربڵاوی بیانییەکان بۆ ناوچەکە. لەم قۆناغەدا دەوڵەتە بیانییەکان یارمەتی سەربازی و ئابووریی ئەو وڵاتانەیان دەدا کە لە ناوچەدا هاوپەیمانی ئەوان بوون. خەڵکی ئەم وڵاتانە لە تەکڕەوی هێزە گەورەکان بەتایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکان بووژانەوەی سەرلەنوێی کۆلۆنیالیزمیان دەدی. ویلایەتە یەکگرتووەکان و پاش

(1) Konfrantasi.
(2) Marr, David G., Vietnamese Anticolonialism 1885-1925, Duiker, 1983, p.67.

ئەو سۆڤییەتی (پێشوو) و کۆماری گەلی چین لە تەواوی ناوچەدا بەدوای ئەو دەوڵەتانەوە بوون کە بکەونە ژێر دەسەڵاتیان. لە کۆتایی دەیەی ١٩٥٠ وڵاتی بچووکی لاوس زیاتر لە هەر وڵاتێکی دیکە لە جیهان لە چاو داهاتی سەرانەی خۆی یارمەتی ئابووریی وەردەگرت. هاتنی زیاتر لەنیو میلیۆن ئەمەریکایی بۆ ڤییتنام لە سەردەمی حکوومەتی لیندون جانسۆن[1]، لە نیوەی دووەمی دەیەی شەست، گۆڕانێکی نوێی لە ناوچەدا پێك هێنا.

شەڕی ڤییتنام و شکستی پەیمان ستیو بووە هۆی ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان وڵاتانی ناوچە هان بدا بۆ پێك هێنانی یەکیەتی وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا (ئاسیَ ئان). یەکیەتی ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٧ پێکهات و پێنج ئەندامی سەرەکیی هەبوو، واتە تایلەند، مالیزیا، سەنگاپوور، ئەندۆنیزیا و فیلیپین. ئەم یەکیەتییە لە ساڵی ١٩٨٥ بە وەرگرتنی وڵاتی شانشینی برۆنی گەیشتە شەش ئەندام. بێرمە نەچووە ئەم یەکیەتییەوە و بەناو رێگای سۆسیالیزمی بەشێوازی بێرمەی گرتە پێش. رانگون تا ساڵی ١٩٧٩ ئەندامی بزووتنەوەی بێ لایەن[2] بوو، بەڵام لەو ساڵەدا بەهۆی بەستراوەیی وڵاتانی ئەندام بە یەکێك لە هێزە جیهانییەکانی رۆژهەڵات یا رۆژئاوا ئەم بزووتنەوەیەی بەجێهێشت.

کۆماری سۆسیالیستی ڤییتنام کە لەڕووی سیاسییەوە شوێنکەوتووی سیستەمی کۆماری دیموکراتی ڤییتنام (ڤییتنامی باکوور) بوو بەهۆی وەرنەگیرانی لە پەیمانی ئاسیَ ئان نەیتوانی لە یارمەتییەماڵییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و رێکخراوەکانی دیکەی ماڵیی جیهان کە لەژێر نفووزی ئەمەریکادا بوون، کەڵك وەربگرێ. هەربۆیە ڤییتنام بە ئیمزای رێککەوتننامەی ١٩٧٨ی سۆڤییەتی (پێشوو) بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی هاریکاریی دوو لایەنەی ئابووری (کۆمێکون)[3] و کەوتە ژێر کاریگەریی سۆڤییەت. ڤییتنام لە ساڵی ١٩٧٩ بەهۆی هێرش بۆ سەر کامبۆدیا و رووخانی حکوومەتی خوێنمژی پۆل پۆت (پشتیوانی چین) لە یارمەتییە ئابوورییەکانی چین بێ بەش بوو.

کەوابوو لانی کەم بەدرێژایی پەنجا ساڵی رابردوو، وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بێجگە لە بێرمە لە چوارچێوەی سیاسەتی نێونەتەوەییدا بەستراوە بە هێزە گەورەکان بوون و وڵاتانی

(1) Lyndon B. Johnston.
(2) Non- Aligned movement (NAM).
(3) Council for Mutual Economic Assistance (Comecon).



ناوچە بە پێچەوانەی رابردوو پرۆگرامە ئابوورییەکانیان بە شێوەیەك گەڵاڵە کرد کە ئاسەواری جێگای سەرنجی لە کۆمەڵگا و شێوەی ژیانی خەڵکی بەجێهێشت. لە دەیەی ١٩٨٠ گۆڕانکاری ئابووری کە بەهۆی دژایەتی لەگەڵ کۆلۆنیالیزم هاتبووە ئاراوە بووە هۆی ئەوەی کە چەند وڵاتی ناوچە بچنە جیهانی پیشەسازییەوە و لەم رووەوە چالاکییەکانی خۆیان دەست پێکرد. لە دەیەی ١٩٩٠ چوارچێوەی ئەم رەوتە پەرەسەندنی زیاتری بەخۆوە بینی و هەر ئێستاش وڵاتی دوورگەیی سەنگاپوور پەیوەست بووە بە وڵاتانی پەرەسەندووی جیهانی و مالیزیا و تایلەند و ئەندۆنیزیاش بازدانێکی جێگای سەرنجیان لەخۆیان نیشاندا و لە ماوەیەکی نەزۆر درێژدا دەتوانن ئەو رێگایە بگرنە پێش کە سەنگاپوور بڕی[1]. لەوڵاتانی دیکەی ناوچەدا بەهۆی ستراتیژیی ناهەماهەنگ یان بەهۆی کێشە نێوخۆییەکان، ئەم گەشەسەندنە ئاهەنگێکی لەسەرەخۆتری بووە. وڵاتانی ناوچە بەهۆی ئەو کۆسپانەی کە لە رێکخستنی سەرمایەی نێوخۆیی هەیانبوو، پێشوازییان لە سەرمایەگوزاری دەرەکی کرد و بۆ پەرەپێدان و گەشەی ئابووری سوودیان لە قەرزی جۆراوجۆر وەرگرت، بەتایبەت بێرمە و وڵاتانی کۆمۆنیستیی دیکە بۆ پەرەپێدانی ئابووری پێویستیان بە وەرگرتنی ئەم قەرزانە بووە.

کورتکردنەوەی دەستی کۆلۆنیالیزم لە ناوچە کۆتایی بە بەربەستی بازرگانی لە بەرامبەر وڵاتانی ئەوروپایی هێنا. ئیتر بەریتانیا، فەڕەنسا و هۆڵەندا چاودێرییان بەسەر سەرمایەگوزارییەکاندا نەما و کۆنترۆڵی ناردنە دەرەوەی بەرهەمی بێرمە، مالایا، ئەندۆنیزیا و هیندوچین بۆ دەرەوەی سنوورەکانی ئەم وڵاتانەیان لەدەستدا. دوای جەنگ، هێزی ئابووریی ئەمەریکا دەرەتانی بەم وڵاتانەدا وەك هاوکاری بازرگانی، رۆڵی گرینگی خۆیان لە ناوچەدا بگێڕن. ژاپۆنیش لەنیوەی دووەمی دەیەی حەفتا، چالاکیی بازرگانی و ئابووریی بەشێوەی بەربڵاو لە ناوچەدا دەست پێکرد و زۆر زوو رۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی گرتە ئەستۆ. لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢ یەك پێنجەمی سەرمایەگوزارییەکانی ژاپۆن تایبەت بوو بە وڵاتانی ئاسیَ ئان. ژاپۆن لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا رادەیەکی زۆر کەرەستەی خاو، دار، نەوت و گازی سروشتیی وەردەگرت و هەروەها نزیکەی نیوەی چالاکییە بازرگانییەکانی ژاپۆن لەم ناوچەیەدا بوو[2].

(1) Wilson, H. E., Social Engineering in Singapore, 1987, Hoysee Puldications, p.559.
(2) Rieger, Hans Christoph, ASEAN Cooperation and Intra Asean Trad, 1986, p.50.

بەستراوەیی وڵاتانی ناوچە بە ژاپۆن زیادی کرد، لە کۆتایی دەیەی هەشتا زیاتر لە نیوەی نەوتی هەڵێنجاوی وڵاتی ئەندۆنیزیا و زیاتر لە دوو سێهەمی مسی فیلیپین نێردرایە ژاپۆن.

دیارە ژاپۆن لەگەڵ گیروگرفتیش رووبەڕوو بوو، چونکە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا تەواوی وڵاتانی ناوچە بێجگە لە تایلەند (کە پێوەندییەکی تایبەتیی لەگەڵ ژاپۆن هەبوو) لەلایەن ژاپۆنەوە داگیرکران و زیانێکی زۆریان لێکەوت. لەم رووەوە، ژاپۆن لەناوچەدا کەوتە بەر نەفرەت. ساڵەکانی ١٩٧٠-١٩٧٥ لە چەند وڵاتی ناوچە خۆپێشاندان دژی ژاپۆن وەرێ خرا. لە دەیەی ١٩٨٠ رێبەرانی ئەندۆنیزیا و فیلیپین لە چوونە سەری بوودجەی سەربازی و مانەوەی ستراتیژی ژاپۆن لە ناوچەدا نیگەران بوون و رەخنەی توونديان لە ئەمەریکا گرت کە هۆکاری ئەم رەوشە بووە، بەڵام لە مالیزیا ماهاتیر بن محەمەد[1] کە لە ساڵی ١٩٨١ دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت[2]، رەزامەندی خۆی دەربڕیبوو. ناوبراو ژاپۆنی وەك سەمبولێك بۆ سیستەمی سەرمایەداری مالیزیا دەزانی، نە وەك نێوبژیوانی پەرەسەندنی سەرمایەداری، هەروەك چۆن وڵاتانی رۆژئاوا لە مالیزیا وابوون- بەستراوەیی وڵاتانی ناوچە بە ژاپۆن بەهۆی ئەو کێشانەوە بوو کە لە ئاکامی دەسەڵاتی ئەمەریکا بۆ سەر قەرزدەرە جیهانییەکان وەك بانکی جیهانی و بانکی پەرەپێدانی ئاسیایی هاتبوونە پێشێ.

### بە پیشەسازی بوون، ئامانجی سەرەکی

پاش رزگاربوون لەژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم، ئامانجی هەموو سیاسەتوانانی ناوچە بە پیشەسازی کردنی کۆمەڵگای خۆیان بوو. بەستراوەیی ئابووری ناوچە بەناردنە دەرەوەی کاڵا سەرەتاییەکان وەك برنج، قەڵایی، کاوچۆ و هتد... و هێنانی کاڵا دروستکراوەکان وەك ئۆتۆمبێل و قوماش وای کرد وڵاتانی ناوچە بێجگە لە لاوس، پڕۆگرامەکانیان بۆ وەدەستهێنانی پێگەی خۆیان لەڕووی پەرەپێدانی پیشەسازییەوە گەڵاڵە بکەن. ئەم وڵاتانە بۆ ئەوەی بتوانن پێش بەهاتنی ئەم کاڵانە بگرن، سەرەتا روویان کردە سیاسەتی جێگۆڕکێی هاوردە[3]. سەرمایەی

(1) Mahathir Bin Mohamad.

(٢) سەرنج بدەنە: شاهندە، بهزاد: A Developed Nation by the First Quarter of the twenty first century روزنامه تهران تایمز، ش١٨٢، مورخ١٦/٨/٧١.

(3) Import – Substitution Industries.



پێویست بۆ بەڕێوەبردنی ئەم پڕۆگرامانە دەبوایە لە رێگای ناردنی کەرستەی خاو دابین بکرایە. بە پێکهێنانی کۆسپی تەعرەفەیی بۆ پشتیوانی و پارێزگاری لە پیشەسازیی تازە پێگرتوو و کەڵکوەرگرتن لە کرێکاری هەرزان، چەند وڵاتی ناوچە توانییان بە یارمەتی کۆمپانیا بیانییەکان تاڕادەیەك سەرکەوتن بەدەست بێنن و بە پێکهێنانی پیشەسازی تایبەتی یان دەوڵەتی بە ئامانجی خۆیان بگەن. لە دەیەی ١٩٦٠-١٩٧٠ وڵاتانی (ئاسیٚ ئان)، بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ فشارەکانی ئەمەریکا و ژاپۆن و هەروەها بۆ راکێشانی ژمارەیەکی زۆر لە بێکارەکان، سیاسەتی هاندانی ناردنە دەرەوەی کاڵای[1] لە رێگای بردنە سەری هاوردە دانا. پێشوازی لە سەرمایە دەرەکییەکان لە ناوچە دەکرا هەتا لە بونیاتنانی کۆمەڵگا گەورەکانی مونتاژ کەڵکی لێ وەربگیرێ. سەرەتا وڵاتانی ناوچە، بایەخیان بە پێکهێنان و پەرەپێدانی پیشەسازی چنین و پێڵاو دا، هەتا بەرهەمهێنانی ئامرازی پێشکەوتوو وەك رادیۆ، تەلەفزیۆن و هتد... سەنگاپوور بە هاندان و پشتیوانی کردنی (لی کوان یو)، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی وڵات لەم رووەوە پێشڕەوبوو و بووە ناوەندێك بۆ ئەنبار کردن (کەمبوونەوەی دەسەڵاتی دەریایی لە ناوچە لەم پێوەندییەدا رۆڵی گرینگی بووە، چونکە بووە هۆی ئەوەی کە سەنگاپوور پشت بەخۆی ببەستێ.)

لە دەیەی ١٩٧٠ وڵاتانی دیکەی (ئاسیٚ ئان) هەر ئەم ستراتیژییەیان گرتەبەر و لەو کاتەوە قوماش، جل و بەرگ و پێڵاو لە وڵاتانی ئەندۆنیزیا، فیلیپین، تایلەند و مالیزیا بۆ رۆژئاوا دەنێردران، بەجۆرێك کە لە زۆربەری بازاڕەکانی رۆژئاوا بەڕادەیەکی زۆر ئەم بەرهەمانە بەرچاو دەکەوتن. سەرەڕای ئەمەش بەشێکی بەرچاو لە سەرمایەگوزارییەکانی دەرەوە لە ناوچە (وەك ژاپۆن) بۆ بەرهەمهێنان و ناردنە دەرەوەی کاڵا سەرەتاییەکان وەك دار، قەڵایی، نەوت و کاوچۆ تەرخان کرابوو. بەرزونزمبوونەوەی بەها نێونەتەوەییەکان لە پێوەندی لەگەڵ کاڵاگەلێك وەك برنج، رۆن، دار، ناوکی نارگیل و بەرهەمەکانی دیکەی کشتوکاڵی، بە ملیۆن کەس لە خەڵکی ئەم ناوچەیەی بەخسیری وڵاتە بیانییەکان کردبوو، وەك قۆناغی کۆلۆنیالیزم کە بەکردەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە لەژێر دەسەڵاتی ئابووری و سیاسی رۆژئاوادا بوون.

گەشەی ئابووریی وڵاتانی (ئاسیٚ ئان) لە دەیەی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ و لە حاڵی حازردا بەستراوە بەم ئەسڵەیە کە بتوانێ کەشێکی لەبار و جێگای متمانە بۆ سەرمایەکانی دەرەکی

(1) Exbort oriented Industrialization.

پێکبێنێ. ئەم کارە هەندێك ئاسەواری خراپی سیاسی بەدواوە بوو بۆ وێنە پێکهێنانی هێزە فراوانخوازەکان لە ئاستی ناوچەدا. سیاسەتی بەڕێوەبەری سەنگاپوور و وڵاتانی مالیزیا، ئەندۆنیزیا، تایلەند و فیلیپین کە بووە هۆی کەمبوونی ڕادەی داهات، بەردەوام لەلایەن خەڵکی ناوچەوە ڕەخنەی لێگیراوە.

پەرەپێدانی ئابووری بەپێچەوانەی هەموو کاریگەرە خراپەکانی لە بەشێك لە کۆمەڵگا و لە زۆربەی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا جێگای ڕێزبووە. لەساڵی ١٩٨٠ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا تەنانەت زیاتر لە چین و هیندوستان لەگەڵ ڕۆژئاوا تیجارەتیان بووە و کاڵایان ئاڵوێر کردووە. بەدرێژایی دەیەی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ گەشەی ساڵانەی ئابووری لە چەند وڵاتی ناوچە نزیك بە ٨ لە سەد و داهاتی سەرانەی سەنگاپوور زیاتر لە ١٢ هەزار دۆلار بووە و لە مالیزیا ئەم ژمارەیە گەیشتووەتە نزیکەی ٣ هەزار دۆلار لە ساڵدا. دوای سەنگاپوور و مالیزیا دوو وڵاتی تایلەند و ئەندۆنیزیا لەڕووی داهاتی سەرانەوە لە بەرزترین ئاستدا بوون. وڵاتی فیلیپین کە بە وتەی هەندێك لێکۆڵەر هێشتا وڵاتێکی نێوە دەرەبەگە، بەهۆی نفوزی بنەماڵە کۆنەکان- وەك گویوانکۆ[1]- نەیتوانیووە لە بارودۆخی هەنووکەیی کەڵك وەربگرێ، چونکە هەروا گیرۆدەی کێشەکانی کۆمەڵگای چینایەتییە و بەردەوامی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لەم وڵاتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارە. چوار وڵاتی بێرمە، لاوس، کامبۆدیا و ڤییتنام لە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی دیکە لەڕووی بەرهەمی پالفتە نەبووی نەتەوەیی پێگەیەکی ئەوتۆیان نەبووە و وەك هەژارترین وڵاتانی جیهان سەیریان دەکرێ. دەوڵەتی ڤییتنام لە ساڵی ١٩٨٦ چەندین گەڵاڵەی وەك سیاسەتی نۆژەنکردنەوە (دوومووا)[2] دەست پێکردووە کە ڕەوشی ئەم وڵاتە و هەروەها ناوچەی هیندوچین لە داهاتووی نزیکدا دەگۆڕێ. وڵاتی شانشینی برۆنی کە وڵاتێکی بچووك بە حەشیمەتی ٢٥٠ هەزار کەسییە، داهاتی سەرانەی زیاتر لە ١٧ هەزار دۆلار لە ساڵ دایە کە هۆیەکەی بوونی سەرچاوەی دەوڵەمەندی نەوتە لەم وڵاتەدا. بەپێچەوانەی گەشەی ئابووری هەندێك لە وڵاتانی ناوچە بەستراوەییان بە بازاڕە نێونەتەوەییەکان و سەرمایەگوزارییە دەرەکییەکان حاشا هەڵنەگرە، لە حاڵێکدا هاتنەخوارەوەی بەهای قەڵایی، برنج و نەوت لە

---

(1) Cojuanco.
(2) c f: Shahandeh, Behzad, “Vietnam’s Doi Moi and Bright Propect for closer Tiet with Iran”, Tehran
.Times, April 25, 1993, p.14.



ناوەڕاستی دەیەی هەشتا بووە هۆی نیگەرانی هەندێك لە دەوڵەتەکانی ناوچە. ئەم دەوڵەتانە نیگەرانی ئاسەواری سیاسیی ئەم مەسەلەیە بوون، چونکە لە کاردانەوەی خراپی لەسەر ژیانی خەڵك و دژکردەوەی ئەوان دەترسان، خەڵکێك کە چەندین ساڵ بەدوای یەکدا بە بەڵێنی ئاسایش، سەقامگیریی ئابووری و پێشکەوتن، ئازار و مەینەتییەکی زۆریان کێشابوو. گۆڕانکاری ئابووری لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی ناوچە ئاسەواری جیاوازی هەبووە، بۆ نموونە هاتنەخوارەوەی بەهای نەوت بۆ مالیزیا و ئەندۆنیزیا جێگای نیگەرانی و بۆ تایلەند، فیلیپین و هیندوچین کە نەوتیان دەکڕێ، جێگای ڕەزامەندی بوو.

کێشەیەکی دیکەی وڵاتانی ناوچە چوونە سەری قەرزەکانیان لە بانکەکان و ڕێکخراوە فرە نەتەوەییەکاندا بوو. سەرەڕای ئەمەش، لە دەیەی ١٩٨٠ کێشەیماڵی وڵاتانی ناوچە بێجگە لە فیلیپین کە ڕێژەی قەرزەکەی ٢٧ میلیارد دۆلار بوو-لە بەراورد لەگەڵ کێشەکانی ئەمەریکای باشوور ئەوەندە گەورە و بەرچاو نەبوو. سەرفی ٣٠-٤٠ لە سەدی داهاتی بەدەست هاتوو لە ناردنە دەرەوەی کاڵا بۆ دانەوەی قەرز، ڕەنگە بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا زۆر قورس بێ. تەنانەت لە وڵاتێك وەك تایلەند کە دانەوەی قەرزەکان، ٢٥ لە سەدی داهاتی وڵاتی بەخۆوە تەرخان کردبوو، زۆربەی گەڵاڵەکانیان بەهۆی نەبوونی دەرەتانی ماڵیی ڕاوەستاوە و جێبەجێ کردنی بەستراوەتەوە بە وەرگرتنی قەرز.

وڵاتانی (ئاسیٛ ئان) بە پێچەوانەی هاریکارییە ڕواڵەتییەکان لەگەڵ یەکتر، لەڕووی ئابوورییەوە بەشێوەی داخراو و پاوانکراو هەڵسووکەوت دەکەن و کێبەڕکێی توونديان لە بازارە نێونەتەوەییەکاندا هەیە. ئەم مەسەلەیە جێگای سەرسووڕمان نییە، چونکە زۆربەی وڵاتانی ئەم ناوچەیە خاوەنی سەرچاوەی سروشتی یەکسانن و لەگەڵ ئەمەشدا لەڕووی توانا ئینسانییەکانیشەوە لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا وەك یەکن.

بەدرێژایی دەیەی ٧٠ و ٨٠، دەوڵەتی بێرمە بۆ پەرەپێدانی پیشەسازی و ئابووری جۆرێك ستراتیژی جیاوازی لەگەڵ وڵاتانی ئەندامی (ئاسیٛ ئان) گەڵاڵە کردووە. لە دەیەی ١٩٥٠ زۆرتر، گەڵاڵە هاوبەشەکان و کەڵکوەرگرتن لە سەرمایە دەرەکییەکان باوبووە، بەڵام پاش ساڵی ١٩٦٢ سیاسەتی سەربەخۆ وەك تەنیا ڕێگای پاراستنی سەربەخۆیی ئابووری، کە دەیتوانی لە نێوان گوندنشینەکان و کرێکاران لەگەڵ چینەکانی دیکە هاوسەنگی پێکبێنێ، پێی لەسەر داگیرا. ئاکامی کردەوەی دەوڵەتی ڕانگۆن، گەشەی یەکجار لەسەرەخۆی ئابووری ئەو وڵاتە لە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی ئاسیٛ ئاندا بوو. لەدەیەی ١٩٥٠ یان بەشێوەی گشتی لە سەرەتای

ساڵەکانی سەربەخۆیی بێرمە (١٩٤٨)، ئەم وڵاتە بەکەڵکوەرگرتن لە غەرامەی شەڕ کە لە ژاپۆن وەریگرتبوو و هەروەها قەرز لە بوونیادە ماڵییە نێونەتەوەییەکان توانی تاڕادەیەك پیشەسازی وڵاتەکەی ببووژێنێتەوە و ئاستی بەرهەمهێنانی تاڕادەیەك بباتە سەرێ، بەڵام لە دەیەی ١٩٨٠ خەڵکی لەگەڵ کەمبوونی هەندێك لەو کەرەستانە بەرەوڕوو بوون کە پێویست بوون. لە دەیەی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ بازاڕی ڕەش کە لە تەنیشت بازاڕی دەوڵەتی دانرابوو کاڵای قاچاخی دەگەیاندە دەستی چینی سەرووی کۆمەڵ. دەوڵەتی ڕانگۆن نەتەنیا بە گرتنە پێشی سیاسەتی سەربەخۆ و توندی ئابووری نەیتوانی بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ بێ و کاریگەری لەسەر پێکهاتەی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی وڵات دابنێ، بەڵکو بووە هۆی بەردەوام بوونی بارودۆخەکە بە قازانجی چینی سەرووی کۆمەڵ و پەرەپێدانی هەژاری.

وڵاتانی کۆمۆنیستی هیندوچین کە لەگەڵ وڵاتانی (ئاسێ ئان) و ویلایەتە یەکگرتووەکان پێوەندییان نەبوو، بەرەیەکی ئابوورییان پێکهێنا. وڵاتی ڤییتنام لە حاڵێکدا کە لەڕووی پانتایی خاك و توانای ئابووری و بارهێنان تاڕادەیەك باش بوو، لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ لاوس و لە ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ کامبۆدیا پێوەندیی تایبەتی دامەزراند. ئەم وڵاتە سەرەڕای لاوازی ماڵیی (داهاتی سەرانەی ئەم وڵاتە ٧١ ملیۆن کەسییە بەپێی ئاماری خەملێندراو بەرامبەرە بە ١٨٠ دۆلاری ئەمەریکایی لە ساڵدا) لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ قەرزی بەبێ قازانجی پێشکەش بە لاوس کرد. هاوپێوەندی دوو شاری هووشی مین و پێنوم پێن نیشاندەری بەردەوامی دەسەڵاتخوازی ڤییتنامە. بەڵام ڤییتنام بۆخۆی یەخسیری یەکیەتی سۆڤییەت بوو و بەهۆی پێویستی بە نەوت، ئاسن، پۆڵا، کوودی کیمیایی و هتد... بەستراوە بەم وڵاتە بوو و قەرزەکانی ڤییتنام بە سۆڤییەت بەڕادەیەك چووبووە سەرێ کە لە ساڵی ١٩٨١ دەوڵەتی هانۆی بۆ دانەوەی قەرزەکەی ناچاربوو هەزار کرێکار بۆ کارکردن لە کارگە و کانەکانی سۆڤییەت ڕەوانەی ئەو وڵاتە بکا[1].

گۆڕانکاریی ئابووری لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە لە ساڵی ١٩٤٥ دەستی پێکراوە، ژینگەی ناوچەی بە تەواوی گۆڕی. بۆ وێنە، پەرەستاندنی خێرای پیشەسازی دار، بەتایبەت لە ئەندۆنیزیا، تایلەند، مالیزیا، فیلیپین و ڤییتنام بووە هۆی لەنێوچوونی خێرایی

(1) Nguyen, Van Canh and Earle Cooper, Vietnam under Communism, Benoit Pub, 1983, P.114.



خاك و فەوتانی دارستانەکان و کەمبوونی ئاو. ڕەنگە یەك سێهەمی دارستانەکانی ڤیتنام لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٤٥-١٩٨٠ لەنێوچوو بێ (چ لە ئاکامی چالاکی یاسایی و چ نایاسایی). کەڵك وەرگرتنی بێ سەرەوبەرە لە کوودی کیمیایی و دەرمانە ژاراوییەکان بۆ زیادکردنی جۆرێك برنج، ناسراو بە برنجی سیحراوی[1]- کە بووە هۆی ئەوەی زۆربەی وڵاتانی ناوچە هەوڵی بردنە سەری ڕێژەی ناردنە دەرەوەی برنج بدەن- چۆمەکان و ڕووبارەکانیان ژاراوی کرد و لە ئاکامدا زیانێکی بەرچاو بە ماسییەکان- کە پاش برنج سەرچاوەی سەرەکی خۆراکی خەڵکی ناوچەیە گەیشت. پاشماوە بێ کەڵکەکانی پیشەسازیش گەیشتوونە ناوچە و هەر ئێستا گرووپەکانی پارێزەری ژینگە بەتایبەت لە مالیزیا و فیلیپین زۆر چالاکن.

### ئایدۆلۆژیاکان لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا

لە ساڵەکانی پاش جەنگی دووەمی جیهانی چوارچێوەی سیاسەتە نێوخۆییەکان لە زۆربەی وڵاتانی ناوچە ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات. لە سەرتاسەری ناوچە بەشێکی بەرچاو لە گەڵاڵە و پڕۆگرامەکان بەڕێوەچوون. بەگشتی لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ ڕەوتی دەسەڵاتخوازی لە زۆربەی وڵاتانی ناوچە بەرچاو و بەردەوام پەرەی دەستاند لە دەیەی ١٩٤٠ و سەرەتای ١٩٥٠ ژمارەیەك لە ڕێبەرە سیاسییەکان ڕوویان لە سەمبوڵە سیاسییەکانی ڕۆژئاوا کرد، بەبێ ئەوەی زانیاری دروستیان لە سەریان بێ یان لانی کەم بایەخ بە بەراوردکردنی لەگەڵ بارودۆخی ئەم ناوچەیە بدەن. ئەم سەمبۆڵانە بە کردەوە لەگەڵ شکست بەرەوڕوو بووە و پشتیوانەکانیان ریسوابوون. لە بەرامبەردا کەسانێك وەك نو، سەکارنۆ و سیهانۆك بە پشت بەستن بە کەسایەتی خۆیان و هاوکاری چەند ڕاوێژکارێك بۆ بەڕێوەبردنی وڵات هەوڵێکی لێبڕاوانەیاندا.

چەمکگەلێك وەك ((دیموکراسی ڕێنوێنی کراو))ێ سوکارنۆ، ((سوسیالیزمی بودایی))ی سیهانوك لە ناوچەدا هاتنە بەرباس ((نگودین دیم))[2]یش کەسایەتییەك بوو وەك سوکارنۆ و سیهانوك، فەلسەفەی کەسایەتی خوازی ناوبراو زۆر پێوەندیی بە هزری ڕۆژئاواییەوە نەبوو.

ڕێبەرە سیاسی و سەربازییەکان لەمێژبوو بەدوای ئەوەدا بوون کە یەکیەتییەکی نوێ لە وڵاتە تازە سەربەخۆبووەکان پێك بێنن، شتێك کە زیاتر لە یەکیەتییەکی ڕواڵەتی لە سنووری

(1) Miracle-Rice.
(2) Ngo Dinh Diem.

جوگرافیا پێدا بێ. لە هەمان کاتدا، ژمارەیەك لە رێبەرانی سەربازی، کە پێیان وابوو هۆکاری سەربەخۆیی وڵاتەکەیانن، لە ئیدارەکردنی وڵاتەکەیان لەلایەن رێبەرێکی کاریزما ناڕازی بوون و پاش ماوەیەکی کورت بەناوی پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی جڵەوی دەسەڵاتیان لە وڵاتی خۆیان گرتە دەست. لە دەیەی ١٩٦٠ وڵاتی فیلیپین، سەنگاپوور و مالیزیا لە بەراورد لەگەڵ ئەندۆنیزیا، بێرمە و ڤییتنام کۆمەڵگایەکی تاڕادەیەك ئازادبوو، چونکە خەڵکی وڵاتەکەیان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی کێشەیان نەبوو و رێبەرەکانیان بەهۆی بوونی رەوایی سیاسی زیاتر، لە پێگەی خۆیان زۆر دڵنیابوون.

لە دەیەی ١٩٧٠ بە راگەیاندنی حکوومەتی سەربازی لە فیلیپین، نیهادینە بوونی سیستەمی تاك حیزبی لە ئەندۆنیزیا و سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە هیندوچین، دەسەڵاتخوازی رەوتێکی خێراتری بەخۆوە گرت. فردیناند مارکوس، سەرۆك کۆماری فیلیپین (١٩٦٥-١٩٨٦)، چەمکی دەسەڵاتخوازیی یاسایی[١] پەرەپێدا، کە دواتر وەك سەمبوڵ لە ناوچەدا چاویان لێکرد. یەکیەتی نەتەوەیی وەك سەرچاوەی سەرەکی ئەم بیرۆکەیە لە ناوچەدا هاتە بەرباس. لە نموونە دیارەکانی ئەم بیرۆکەیە دەتوانین سەرەڕای فیلیپین لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥-١٩٨٦ (حکوومەتی خاتوو اکینو) ئاماژە بەم خاڵانەش بکەین، بزووتنەوەی گۆلکار[٢] بە رێبەرایەتی ژنراڵ سوهارتو لە ئەندۆنیزیا، حیزبی لانسینگ[٣] لە بێرمە و هەندێك لە حکوومەتە سەربازییەکان لە تایلەند. هەڵسووکەوتی دەوڵەتی مالیزیا لە ساڵی ١٩٦٩ بە پێوەندی لەگەڵ چاکسازی یاسای بنەڕەتی بۆ بەرتەسك کردنەوەی ئازاری رادەربڕین و بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەڕێوەبەریی دەوڵەت لە بەرامبەر دەزگای یاسادانانادا دەتوانین وەك درێژەی هەمان سیاسەتی دەسەڵاتخوازی چاو لێبکەین.

لە دەیەی ١٩٨٠ حیزبە سەربازییەکان لە بێرمە و ڤییتنام جڵەوی کەدەسەڵاتیان گرتبووە دەست. ئازادیی سیاسی لە فیلیپین پاش رووخانی حکوومەتی سەرەڕۆی مارکۆس لە ساڵی ١٩٨٦ و ئازادیی سیاسی لە تایلەند لە ١٩٧٣-١٩٧٦ کە برایانی پرۆماج[٤] هێنابوویانە

(1) Constitutional Authoritarianism.
(2) Golkar Movement.
(3) Lensing Party.
(٤) Promaj: لە نەوەکانی شێخ ئەحمەدی قوی بازرگانی گەورەی ئێرانی سەدەی شازدەهەم.



ئاراوە، دیاردەیەکی دەگمەن بوو، چونکە لە دەیەی ١٩٨٠-١٩٩٠ بە کردەوە فەزای دەسەڵاتخوازی لەناوچەدا زاڵ بوو. حکوومەتە سەرەڕۆکان لە سەرەتادا رەوایی سیاسییان نەبوو، بەڵام پاش دڵنیابوون لە مل راکێشانی خەڵك، رەوایی پێویستی سیاسییان بەدەست هێنا. لە حاڵی حازردا خەڵکی ئەم ناوچەیە ئامادەی جێبەجێ کردنی بڕیارەکان و پشتیوانی لە سیستەمی وڵاتەکەیانن. خۆشگوزەرانی و سەروەت و سامانێك کە خەڵکی هەندێك لە وڵاتانی ناوچە پاش قبوولکردنی ئازار و مەینەتییەکی زۆر بەدەستیان هێنابوو، بووە میکانیزمی بزووتنەوەیەك لە چەند وڵات، لەوانە ڤییتنام کە هێشتا لێی بێ بەشن. لەم رووەوە، گۆڕانکاریی یەکجار گەورە و ئاڵوگۆڕی بێ وێنە لە وڵاتانی داخراوی ناوچەدا خەریکە روودەدا.

کۆچکردن و راکێشانی گەریدەکان، دوو دیاردەن کە بووە هۆی جوولەی زیاتری ناوچە (لە ٥ ملیۆن کەس کە ساڵی رابردوو سەردانی وڵاتی رازاوە و جێگای سەرنجی سەنگاپووریان کردووە نیوەیان خەڵکی وڵاتانی ناوچە بوون، هەر ئەم بارودۆخە سەبارەت بە گەریدەکانی تایلەندیش راستە). ئەو گەریدانەی سەردانی ئەم وڵاتەیان کردووە بە دیتنی سەرکەوتن و پێشکەوتنە ئابووری و سیاسییەکان لە هەوڵی ناسینی سەمبۆڵەکانی ئەم وڵاتانە بوون و بە چاولێکردن لەو پێشکەوتنانە گۆڕانکاری پێویستیان لە وڵاتانی خۆیان پێکهێناوە[١]. لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا کۆچکردن زۆرتر بە دوو شێواز بەڕێوەچووە یەکەم، کۆچکردنی دڵخوازانە، واتە بەجێهێشتنی زێدیان بۆ وەدەستهێنانی ژیانی باشتر لە وڵاتانی دیکە. لەم جۆرە کۆچکردنەدا، بەشی زۆری کۆچبەران روو لە ناوچەگەلێك دەکەن کە لەڕووی فەرهەنگییەوە لێك نزیك بن (بۆ نموونە کرێکاری فیلیپینی، کارکردنی لە سەنگاپوور پێ باشترە لە کارکردن لە کوێت.) دووەم، کۆچکردنی زۆرەملێیە کە سەرچاوەی سیاسیی هەیە، لەم پێوەندییەدا کۆچی بە کۆمەڵ و زۆرەملێ لە کامبۆدیا، لاوس و ڤییتنام لە ساڵی ١٩٧٥ باشترین نموونەیە. کاتێك کە رژێمە کۆمۆنیستەکان لە سێ وڵاتی ناوبراو دەسەڵاتیان گرتە دەست زیاتر لە یەك ملیۆن ژن و منداڵ لە رێگای وشکایی، ئاوەکان و ئاسمانەوە روویان لە رۆژئاوا کرد و لە ناوچەی هیندوچین دەرچوون. ئەم پەنابەرانە زیاتر کەسانێك بوون کە پێوەندییەکی نزیکیان بە ئەمەریکاوە هەبوو یان ئەو چینیە کۆچبەرانە بوون کە ترسیان لە سیاسەتەکانی ڤییتنام هەبوو کە لە هەر سێ

(1) Wyatt, D. K., Thailand: A Short History, 1984, Bangkok univ. Press, p.78.

وڵاتدا دەسەڵاتی هەبوو و سەرەنجام کەسانێك بوون کە بەرامبەر بە سیستەمە سۆسیالیستییەکان ڕەشبین بوون.

لە دەیەی هەشتا هەڵاتنی خەڵك لە هیندوچین کەم بووەوە، چونکە خەڵکی ئەوروپا ئیتر ئەوانی وەرنەدەگرت. سەرەڕای ئەوەش هاتنە دەرەوەی ڤییتنام لە کامبۆدیا بەپێی ڕێککەوتننامەی سیپتامبری ١٩٨٩ و دەستپێکردنی وتووێژی ئاشتیی. کامبۆدیا، هۆکارێك بۆ هەڵاتن نەما. بەهەرحاڵ، لەدەستدانی ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕان لە ئاکامی کۆچی زۆرەملێی لەڕووی ئابووری و فەرهەنگییەوە زەبرێکی قورسی لە ناوچەی هیندوچین دا. کۆچکردن و پەنابەری لە خودی ناوچەکەشدا بەرچاوبووە بەشێوەیەك لە دەیەی ١٩٨٠ چەند هەزار کەس لە خەڵکی کارن[1] لە بێرمە هەڵاتن و پەنایان بۆ تایلەند برد، وەك کامبۆدیاییەکان کە ڕوویان لە وڵاتی تایلەند کرد.

## گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا

گۆڕانکارییەکانی ناوچە کە لە ئاکامی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی پێك هاتبوو بە پەرەسەندنی ئیمکانات و دەرەتانی پەروەردەکردن، گەشەی زیاتری بەخۆوە بینی. لە ڕوانگەی هەندێك لە چاودێرانی سیاسی-کۆمەلایەتی پەرەسەندنی ئیمکاناتی پەروەردەیی لە ناوچەدا، گەورەترین گۆڕانکارییە کە پاش جەنگی دووەمی جیهانی ڕووی داوە. وڵاتانی ناوچە بۆ گەشەپێدانی پەروەردە و فێرکردن کەوتنە خۆیان و وەك هۆکاری پێشکەوتن و پەرەسەندنی خۆیان سەیریان دەکرد. لەبەر ئەم هۆیە وڵاتی بێرمە سەرەڕای دواکەوتوویی لەچاو وڵاتانی دیکەی ناوچە لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ نزیکەی ١٨ لەسەدی بودجەی خۆی بۆ پەروەردەکردن تەرخان کردبوو (بودجەی پەروەردەکردن پاش بوودجەی بەرگری بوو.)

بۆ ئاشنابوون لە بارودۆخی ئێستای ناوچە لەڕووی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەوە دەبێ مەسەلە بنەڕەتییەکان وەك پەروەردە و فێرکردن تاوتوێ بکەین. لە قۆناغی کۆلۆنیالیزمدا، هۆڵەندییەکان و فەڕەنسییەکان لە پێوەندی لەگەڵ مەسەلەی پەروەردە و بارهێناندا زۆر بیرتەسك بوون. بەریتانیاییەکان لە مالایا و بێرمە ڕوانگەیەکی باشتریان لە

(1) Korens.



پێوەندی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا هەبوو. سەرەڕای ئەمانەش پەروەردەی سەرتر لە ئاستی سەرەتایی لەم دوو ناوچە داگیرکراوەدا تایبەت بوو بە شارستانییەکان و چینی دەست ڕۆیشتوو. ئەمەریکا لە فیلیپیندا بایەخێکی تایبەتی بە پەروەردە و فێرکردن و پەرەپێدانی فەرهەنگی ئەمەریکایی دەدا، بە جۆرێك کە پاش ساڵی ١٩٤٥ ژمارەی زانکۆ و ناوەندە زانستییەکان لە فیلیپین لە شوێنەکانی دیکە زیاترە. لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ وڵاتی فیلیپین زیاتر لە ١,٥ ملیۆن خوێندکاری بووە. لە حاڵێکدا لە ئەندۆنیزیا بە حەشیمەتێك نزیك بە سێ بەرامبەری حەشیمەتی فیلیپین تەنیا ٧٠٠ هەزار خوێندکار دەخوێنن.

بەهەر حاڵ هەموو وڵاتانی ناوچە لە پەرەپێدانی پەروەردە کە دیاردەیەکی بەرچاوی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بوو، بەشداری چالاکانەیان بووە. بۆ وێنە لە وڵاتی سۆسیالیستی ڤییتنام ١٥,٥ ملیۆن کەس واتە یەك چوارەمی هەموو حەشیمەتی وڵات دەچنە قوتابخانە و نزیکەی ١٥٠ هەزار کەسیش بۆ زانکۆکان (١٩٩١) جێگای سەرنجە لە ساڵی ١٩٥٤ (پێکهاتنی کۆماری دیموکراتیکی ڤییتنام) تەنیا دوو بوونیادی پەروەردەیی بەرز لە هەموو وڵاتدا (ڤییتنامی باکوور و ڤییتنامی باشوور) بوو، بەڵام ئێستا زیاتر لە چل بونیادی پەروەردەی بەرز لەم وڵاتەدا چالاکن.

بێجگە لە فیلیپین کە هێشتا قوتابخانەکانی کاتۆلیك ڕۆڵی سەرەکییان هەیە، لە وڵاتانی دیکەی ناوچەدا پەروەردە و فێرکردن لەژێر چاودێری دەوڵەتی ناوەندی دایە، بۆ وێنە لە مالیزیا، خەڵکی مالی (خۆجێیەکانی وڵات) لە ئاستی بەرزی پەروەردەییدا ڕۆڵی دیار و بەرچاویان هەیە و بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو هاوسەنگ نەبوونەی کە لە ڕابردوودا لە نێوان خەڵکی مالی و چینییەکاندا هەبوو، تێدەکۆشان، چینییەکان لە ڕابردوودا بەشی زۆری سەروەت و سامانی وڵاتی مالیزیایان لەبەردەستدا بووە و ئێستاش بە پێچەوانەی هەموو چالاکی و بەربەستەکانی دەوڵەت، هەڵسوورانیان هەیە. بەرپرسانی پەروەردە و فێرکردنی مالیزیا بەرامبەر بە دین و ئایینی نەتەوەیی مالی بایەخی تایبەتییان بۆ دادەنا و فێربوونی ئەوانەیان کردبووە بەشێکی سەرەکی لە بەرنامەی قوتابخانەکان. هەروەها لە سەنگاپوور بنەماکانی قوتابخانەی کۆنفوسیۆس وەك یەکێك لە وانە گرینگەکان لە قوتابخانە بایەخی پێ دەدەن.

لە دەیەی ١٩٨٠ وانە گوتنەوەی مارکسیزم-لینینیزم لە قوتابخانە ناوەندییەکانی ناوچەی هیندوچین زۆرەملێ بووە. بەکورتی، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا وەك شوێنەکانی دیکەی

جیهان حکوومەتەکان بە داڕشتنی پڕۆگرامی درێژخایەن لە بوارەکانی فەرهەنگی لە هەوڵی ئەوەدان کێشە و قەیرانە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان چارەسەر بکەن.

ڕۆڵی خوێندکاران لە جوولانەوە سیاسییەکان و بزووتنەوەکانی ناوچە لەو مەسەلە گرینگانەیە کە دەبێ بایەخی پێ بدرێ. لە سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ ولاتانی تایلەند، کامبۆدیا و ئەندۆنیزیا گۆڕانکاری گرینگیان بەسەرداهات کە هۆیەکەی جیاوازیی نێوان ئایدۆلۆژیا و سیستەمی پەروەردەیی بوو. خوێندکاران لەم ولاتانەدا دژی حکوومەتەکانی زاڵ بەسەر ولاتەکەیان دەستیان دایە خۆپێشاندان و دەربڕینی نارەزایەتی و سەرئەنجام خوێنکارانی تایلەندی توانیان دەولەتی ئەم ولاتە بڕووخێنن. بەشداری لاوانی مالیزیایی لە بزووتنەوەی ئیسلامیی لاوانی مالیزیا و چالاکی ئەوان دژی حکوومەتی کوالالامپور گرینگی تایبەتی هەیە. لاوەکان بە تێکۆشانی بەردەوامی خۆیان ڕێگایان بۆ بەشداری ڕاستەوخۆی سیاسی نباژوویی ئیسلامی خۆش کرد. هەر ئێستا حیزبی ئیسلامی مالیزیا[1] خاوەنی حەوت کورسی لە پەرلەمانی ئەم ولاتەیە و بەسەر یەکێك لە سێزدە هەرێمەکەی (کلانتان) حکوومەت دەکات. هەروەها لە ١٩٨٦ خوێندکارانی فیلیپینی ڕۆڵی سەرەکییان لە ڕووخانی فردیناند مارکوس دا گێڕاوە.

لەڕووی ڕووناکبیرییەوە گۆڕانکارییەکی گرینگ پاش ساڵی ١٩٧٠ ڕوویدا، کە بریتی بوو لە چوونەسەری ڕێژەی خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوەیی نووسراون، ڕاڤەی مێژوو، زانستی سیاسی و زانستی ئابووری بە مەبەستی پێکهێنانی گەشەی زیاتر و هەمەلایەنە لە ولاتانی ناوچە، گەشەیەك کە لەگەڵ بارودۆخ و هەلومەرجی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئەتنیکی و هتد... ناوچە یەك بگرێتەوە[2]. دەیان هەزار خوێندکار لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بۆ درێژەدانی خوێندن ڕوویان لە ڕۆژئاوا کرد یان وەك هەندێك لە خوێندکارانی ولاتانی هیندوچین ڕێی سۆڤییەت و ئەورووپای ڕۆژهەلاتیان گرتەبەر. ئەم خوێندکارانە دوای کۆتایی دەگەڕانەوە زانکۆی ولاتەکانی خۆیان و تێدەکۆشان هەتا خەڵکی ولاتەکەیان لەگەڵ ڕوانگە جۆراوجۆرەکان لە زانستی ئینسانی ئاشنا بکەن و پاشان سیاسەتی

(1) Parti Islam se Malaysia (PAS).
(2) Bresnan, John, Crisis in the Philippines: the Marcos Era and Byond, 1988, Praeger pub, P.170-175.



گونجاو لەگەڵ بارودۆخی ناوچە و ولاتەکەیان پەیدا بکەن و بەشێوەی ڕێك و پێك و دروست بەڕێوە ببەن. بەهۆی سیاسەتی چاکسازیی ئابووری کە پڕۆگرامی سەرەکیی حکوومەتەکان بووە، بارهێنانی کارناسانی تێکنۆکرات و برۆکرات وەك پێویستییەك چاوی لێ دەکرا. بەم جۆرە سیستەمە دەسەلاتخوازەکانی ناوچە کە بە مستی پۆلایین گەشە و پەرەسەندنی ئابووری دەستی پێ کردبوو پاش ماوەیەك لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر لە فێرخوازان بەرەوڕوو بوو کە خوازیاری ئازادییە سیاسییەکان بوون. هاوڕێ لەگەڵ گەشەی زانستی تەکنیکی، گەشەی نیشتیمانپەروەریش پەرە دەگرێ و هەموویان دەبنە هۆی ئەوەی کە ئەم ولاتانە بەرەو سەرکەوتن و پێشکەوتن هەنگاو بنێن.

یەکیەتی ولاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش لە هاتنەدیی ئەم ئامانجە ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو و بە پێکهێنان و هاندانی ئەو ڕێکخراوە ناوچەییانەی ئەرکی توێژینەوەیان لەسەر شانە وەك ئەنیستیتۆی توێژینەوەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا سەرکەوتنی بەرچاوی هەبووە. لەگەڵ هەموو ئەو مەسەلانەی باسمان کرد و سەرەڕای گەشەی سەرسووڕهێنەری ناوچەگەرایی و پێکهێنانی بوونیادە جۆراوجۆرەکان لە ئەندۆنیزیا، فیلیپین، مالیزیا، تایلەند، بەلام بەشێکی بەرچاو لە حەشیمەتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە کۆمەڵگای پەرش و بلاوی گوندنشینەکان پێك دێ و یەکیەتی و یەکڕیزی ئەوان هێشتا نەهاتووەتە دی.

سەرەڕای پەرەئەستاندنی ئابووری لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و چوونە سەری دەرەتانی کار لە کارگەکان و ئیدارەکان هێشتا زیاتر لە نیوەی خەڵکی ئەم ناوچەیە خەریکی کاری وەرزێرین و ڕاوی ماسی و وەرزێری چالاکیی سەرەکیی ئەوان پێك دێنێ. لە نێوان ولاتانی گەورەی ناوچەدا تەنیا ولاتی ١٨ ملیۆنی مالیزیایە کە کەمتر لە نیوەی خەڵکەکەی کاری وەرزێری دەکەن (١٩٩٢). لە بێرمە ٦٥ و لە ڤییتنام ٧١ لە سەدی خەڵك لە ساڵی ١٩٩١ وەرزێر بوون. دیارە سیستەمی ئەرباب ڕەعییەتی هێشتا بەردەوامە و بووەتە کۆسپ لەسەر ڕێی گەشەی خێرای ناوچە، بەلام بە بازرگانیبوونی ئابووری ناوچە کە لە ساڵی ١٩٤٧ دەستی پێکردووە کاریگەریی لەسەر پێوەندیی نەریتی زاڵ بەسەر ناوچەدا داناوە و لە کۆتاییدا ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێنێ. لە ئاسەوارەکانی ئەم گۆڕانکارییە دەتوانین ئاماژە بە ناڕەزایەتی گوندنشینەکانی ناوچەکانی ناوەندی تایلەند لە دەیەی ١٩٦٠-١٩٧٠ بەرامبەر بارودۆخی خراپی خۆیان بکەین.

جیمز سکات لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا، چەکی خەڵکی بێ هێز[1]، سەبارەت بە ئاسەوار و ئاکامی گۆڕانکاریی ئابووری لە ژیانی وەرزێرانی مالاییدا (لە نیمچە دوورگەی مالیزیا) لێکۆڵینەوەیەکی یەکجار وردی کردووە و گۆڕانکارییەکانی سالانی کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ی نیشان داوە. سکات گوندێکی لە هەرێمی کێدا[2] کردووەتە وێنەیەك بۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆی و مەسەلەگەلێك وەك شێوازی ئاودێری، بردنەسەری رێژەی بەرهەم لە زەویدا (دووجار بەرهەم لە ساڵدا)، میکانیزەکردنی وەرزێری بەتایبەت کەڵك وەرگرتن لە مەکینەی خەرمانکوتی تاوتوێ کرد. لێکۆڵینەوەکانی ناوبراو دەری خستووە، ئەو وەرزێرانەی کە زەوی و سەرمایەی زۆرتریان هەیە و بەهۆی دەسەڵاتی ئابووری توانیویانە پێوەندی سیاسیش دامەزرێنن، لە ئیمکانانی جۆراوجۆر وەك وەرگرتنی قەرز کەڵکیان وەرگرتووە و گۆڕانکاری ئابووری بۆ ئەوان بووەتە هۆی قازانجی زیاتر و سەقامگیربوونی رەوشی ژیانیان. باشتربوونی بەرهەمی ئەوان بووەتە هۆی ئەوەی کە لە قازانجی دیکە وەك سەفەر بۆ مەککە، کڕینی خانوو و ئۆتۆمبێل بێ بەش نەبن. بەڵام بۆ وەرزێرانی وردە مالیك یان بێ زەوی گۆڕانکاری تەکنەلۆژیا بووە هۆی نەبوونی ئاسایش و خراپتربوونی بژێوی و گوزەرانی ئەوان. بۆ وێنە ژنانی ئەم دەستەیە کە لە رابردوودا لەکاتی کۆکردنەوەی بەرهەمدا هاوڕێ لەگەڵ مێردەکانیان کاریان دەکرد لە قازانجی مالیی ئەو بەرهەمانە بێ بەش نەدەبوون، بە میکانیزەبوونی وەرزێری، کارەکەیان لەدەستدا و بەمجۆرە سەرچاوەیەکی داهاتیان لێوەرگیرایەوە. سکات لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا دەڵێ کە درزی قوولی نێوان خەڵکی هەژار کە رۆژ بە رۆژ هەژارتر دەبێ و چینی دەوڵەمەند کە هەر رۆژ سەرمایەکەی روو لە زیادبوون دەکا بە تەواوی جێی هاوڕەگەزی و ژیانی وەك یەکی گرتووەتەوە[3].

لە وڵاتانی بێرمە و ڤییتنام سیستەمی پێشوو گۆڕانی بەسەرداهات بەڵام ئەم جار ئەوە داڕشتنی پڕۆگرامی دەوڵەتی بوو کە بووە هۆی ئەم گۆڕانکارییە. ڤییتنام بۆ گۆڕینی رەوشی وەرزێران دەستی دایە گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی. رێبەرانی ئەم وڵاتانە رێگای پەروەردەکردنی

---

(1) Weapons of the Weak.
(2) Kedah.
(3) Scott, James, The Weapon of Poor, Univ, of Hawaii Press, 1989, pp.82-84.





گوندنشینەکانیان گرتە بەر و پاشان ئەوانیان لەگەڵ بنەماڵەیان بە تەنیا بۆ ناوچە بە پیت و بەرەکەتەکان رادەگواست. خەڵك روویان لە ناوچە نوێیە ئابوورییەکان دەکرد و کۆچبەران دواتر توانییان بچنە زانکۆکان یان پەیمانگای مامۆستایان، لە ئاسەواری خراپی ئەم گۆڕانکارییە، هەستکردنی وەرزێران بە بێگانە بوون بەرامبەر بە شوێنی نوێ و بێ هێوایی و خەمۆکی بەهۆی دووری لە بنەماڵەکانیان بوو. بەڵام بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەم گیروگرفتانە ئاکامی سوودبەخشی ئەو زیاتر بوو. چونکە گوندنشینەکان رووبەڕووی پێوەندی و سیستەمێکی نوێی ئیداری بوونەوە کە لەگەڵ پێوەندی و سیستەمی زاڵ لە رابردوودا- کە باب و باپیرانیان تەجرووبەیان کردبوو و خوویان پێ گرتبوو جیاوازی زۆری بوو.

لە ئاسیای رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا پەرەسەندنی گۆڕانکارییە نوێیەکان و جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە فشارێکی زۆری بۆ پاراستنی دیسیپلینی کۆمەلایەتی بۆ سەر دامەزراوە جۆراوجۆرەکان هێنابوو. بۆ بەڕێوەبەرانی کۆمەڵگا حکوومەت کردن بەبێ بەکارهێنانی زۆر ئاسانترە، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە رێبەرەکان بەم راستییە گەیشتوون کە توندوتیژی ئاکامەکەی لەنێوچوونی کۆمەڵگایە و دەبێ دیسپلین و یاسا سەروەربێ. لە روانگەی کۆمەڵناسانی سیاسییەوە، بەکاربردنی زۆر بەکردەوە ئاسەواری خراپی بە دوادا دێ. وەرگرتن و پێڕەوی هاووڵاتییانی ئاگادار لە مەسەلە سیاسییەکان دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی ئەوان سەبارەت بە قازانجی حکوومەت و کۆمەڵگاکە هاووڵاتییان لێی سوودمەند دەبن. ئەم جۆرە وەفادارییە بە سیستەم تەنیا کاتێك دەتوانێ بوونی هەبێ کە لە کۆمەڵگادا بایەخە هاوبەشەکان لە سەرووی چین و نەژادەوە بێ.

لە کۆمەڵگایەکدا کە مێژووییەکی دەوڵەمەندی هەیە، بایەخبەرزەکان بۆ پاراستنی سیستەم دەبینرێ، بەڵام لە کۆمەڵگایەکدا کە بەردەوامی مێژوو لە قۆناغێك لەسەردەم دابڕاوە یان بایەخەکانی رابردوو چووەتە ژێر پرسیارەوە دەبێ بایەخەکان و سەمبولە نوێیەکان پێك بێن. لە تەواوی حاڵەتەکاندا وەرگرتنی بایەخە نوێیەکان رەوتێکی لەسەرخۆی هەیە و پێویستی بە ئامێری پێوەندی گرتنی بەهێز هەیە.

پاش قۆناغی کۆلۆنیالیزم هەندێك لە نوخبەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا جۆرێك پاوانخوازییان لە کاروباری رێکخستن لەخۆ نیشاندان. لەگەڵ ئەوەی کە کەسانێك وەك سوکارنۆ، ساریت و سیهانۆك لەڕووی تیۆرییەوە خەڵکیی بوون، بەڵام لە راستیدا رێگای سەرەڕۆیانەیان

گرتبووەبەر. سەرەڕای ئەمەش، ئەوان ئاگاداربوون لەوەی کە دەبێ هەستی بەشداری خەڵك لە کاروباری پێوەندیدار بەخۆیان ببزوێنن. لەبەر ئەم هۆیە بوو کە حکوومەتەکانی ناوچە ڕوویان لە ئامانج گەلێك وەك پانچاسیلا[١] لە ئەندۆنیزیا، ڕێگای بیرمە بەرەو سوسیالیزم[٢] و یان سێ کەرت کردنی نەتەوە، ئایین و شا[٣] لە تایلەند کرد.

لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا چینێکی نوێ پاش قۆناغی کۆلۆنیالیزم سەریان هەڵدا و لە ئەزموونی ئەو قۆناغە کەڵکیان وەرگرت. ئەم چینە خاوەنی هەندێك تایبەتمەندین کە لەوانی دیکە جیا دەکاتەوە، بۆ وێنە لەبەرکردنی جل و بەرگی وەك یەك و یەك ڕەنگ. ئەم یونیفۆرم لەبەرانە لە ئاستی سەرەوەتر بە میدالیا و نیشانی زێڕینی خۆیان لە بنەڕەتدا کەسایەتیگەلێکی دەسەڵاتخوازبوون کە بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆیان پەنایان بۆ هەر جۆرە توندوتیژییەك دەبرد. ئەوان زۆرجار لە بەرگی سەربازیدا بوون، بەڵام هەندێك جاریش کەسانی غەیرە سەرباز کە لە ڕێکخراوە دەوڵەتییەکاندا کاریان دەرکرد بەم تایبەتمەندییانەوە کاروباری پێوەندیدار بەماڵیات، هاتووچۆ، ئاودێری کۆنترۆڵی حەشیمەت، تەندروستی و پەروەردەو فێرکردنیان ئیدارە دەکرا. ئەم خەڵکە فێرکراو و خوێندەوارە لە شارەکان یا دەرەوەی وڵات کە هەڵگری بیرۆکەی پاوانخوازانە بوون، بایەخێکی ئەوتۆیان بۆ خزمەت بە خەڵك دانەدەنا.

لە دەیەی ١٩٨٠ لە وڵاتانی (ئاسیٚ ئان) و وڵاتانی سۆسیالیستی ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، واتە بیرمە و وڵاتانی هیندوچین ئەم بارودۆخە زاڵ بوو[٤]. لە ڤییتنام بەو کەسانەی کە ئیدارەی کاروباری خەڵکیان لەسەر شانە پێیان دەڵێن کادر[٥]. ئەم کەسانە تەنیا کاری ئیداری دەکەن و وەك ڕێبەرانی کۆنفوسیۆس، زۆر بەکەمی کاری دەستی بەڕێوەدەبەن. لە ڕوانگەی بەرپرسانی دەوڵەتی هانۆی پێگەیاندنی ئەم چینە کۆمەڵایەتییە گەورەترین سەرکەوتنی سیستەمی کۆمۆنیستی کۆماری حیزبی و دەوڵەتی بووە کە لە زانکۆکان یا

(1) Pancei Sila.
(2) The Burmese Way to Socialism.
(3) Trinity of “Nation, Religion and King”.
(٤) سەرنج بدەنە: شاهندە، بهزاد، ((حکومت آمرانه و رشد سریع اقتصادی: تجربه آسیا)) اطلاعات سیاسی- اقتصادی، ش٥١-٥٢، ص١٤-١٨.
(5) Cadre.



قوتابخانە ناوەندییەکان خوێندیان تەواو کردووە. لە ئەندۆنیزیا لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ نزیکەی ١٥ لە سەد لە هێزی کار، واتە ٨ ملیۆن فەرمانبەر، لە ڕێکخراوە دەوڵەتییەکانی ئەم وڵاتەدا سەرقاڵی کاربوون.

پەرەسەندنی کاروباری دەوڵەتی و حیزبی لە سەرتاسەری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا دیاردەیەکی گشتگیربووە. چونکە لەڕووی کۆمەڵناسی سیاسییەوە کەسانێك کار پەیدا دەکەن کە لەڕووی سیاسییەوە گرووپگەلێکی بەدەسەڵات بن هەتا بۆ بژێوی خۆیان بەستراوە بە دەوڵەت بن و بەکردەوە وەفاداربن و مانەوەی ڕژێمی دەسەڵاتدار گەرەنتی بکەن. پشتیوانی لە ڕژێم بە ڕێگای ماڵی یا مەعنەوی بنەمایەکە بۆ پاراستنی سیستەمە دەسەڵاتخوازەکان. بەمجۆرە لە ڤییتنام خوێندەوارەکان نە تەنیا لەگەڵ نەریتە کۆنەکانی ماندارینی ئاشنان، بەڵکو لەگەڵ زانستی کۆمەڵناسی ڕۆژئاوا کە لە مارکسیزم- لینینیزمدا ڕەنگی داوەتەوە خۆیان ڕێکخستووە. سەرەتا حکوومەتی کۆمۆنیستی ڤییتنام دوو دەستە کادری بووە، ڕێکخەرانی سیاسی و پسپۆڕانی سەربازی، بەڵام لە دەیەی ١٩٨٠ توێژی ڕووناکبیر بەشێوەی بەرین چوونە نێو کادرە حیزبی و دەوڵەتییەکان و کاریگەرییان لەسەر سیستەم دانا (هەندێك لە چاودێرانی سیاسی ناوچەکە، هاوسانکردنی سیستەمی سۆسیالیستی ڤییتنام و قبووڵی کردنی سیاسەتی پراگماتیینی و گرتنە پێشی سیاسەتی دەرگای ئاوەڵا، بەهۆی هاتنی ئەم ڕووناکبیرانە بۆ نێو ئەم سیستەمە دەزانن). وەك ڕابردوو کە کەسانی ماندارین کە خاوەن پلەی بەرزی زانستی بوون و لە کۆشکی پاشایەتیدا بوون، لە ڕەوشی گوندنشینەکان بێ ئاگابوون، لە ڤییتنامی نوێشدا کەسانی خوێندەوار لە گوندەکان دوورکەوتنەوە و لە شارەکان نیشتەجێ بوون و چینێکی نوێیان پێکهێناو بە کردەوە لە ڤییتنامی سۆسیالیستیدا کۆمەڵگای چینایەتی پێکهات.

مەسەلەیەکی دیکە کە لە ناسینی ڤییتنامدا کاریگەرە ئەمەیەکە لەکاتی داگیرکردنی سایگون (١٩٧٥) و پێکهێنانی کۆماری سۆسیالیستی (١٩٧٦)، ڤییتنام بەردەوام بەسەر هێڵی ١٧ پلەدا حکوومەتی کردووە و سیاسەتی وڵاتی لەدەستدا بووە، بەڵام نەبزی ئابووری و دەسەڵاتی ماڵیی وڵات بەکردەوە لەدەست ڤییتنامی باشووردا بووە، کە لە باشووری هێڵی ١٧ پلە دامەزراوە و سەرئەنجام دەسەڵاتی سیاسی لە داهاتوویەکی نزیکدا دەگرنە دەست.

خزمەت نەکردنی خوێندەوارەکان لە گوندەکان دیاردەیەکی تایبەت بە ڤییتنام نەبووە و نییە بەڵکو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بەگشتی دەبینرا. بەشێوەی گشتی فەرمانبەران و بەرپرسانی خوێندەوار زیاتر دەیانویست لە شارەکاندا بژین، چونکە لە شارەکاندا ئیمکاناتی

فێرکردن، تەندروستی و هتد... زۆرترە و هەر ئەمە بووە هۆی پەرەسەندنی شارنشینی لە ئاستی ناوچەکەدا. تەنیا لە بێرمە، دەوڵەت پزیشکەکانی وڵاتی لە سووپادا دامەزراندووە و ناچاری کردبوون کە بە پێچەوانەی ویستی خۆیان یان بنەماڵەکانیان لە گوندەکان یا شارە دوورکەوتووەکان خزمەت بکەن. ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٦٢ سیاسەتی ئاماژەپێکراوی بەڕێوەبرد. چینی دەسەڵاتداری بیروکرات، ئەفسەرەکان و شارەزایانی کە لە کۆمەڵگادا خاوەن پلەیەکی بەرزن، بڕیارەکان بە چینی خوارەوەی کۆمەڵ ڕادەگەیەنن. ئەوان خاوەن ئیمکاناتی تایبەتین کە چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵ لێی بێ بەشن، وەك کەڵك وەرگرتن لە فرۆشگاگلی تایبەت بە فەرمانبەرانی پلە بەرز، سەفەرەکانی دەرەوە و هتد... ئیدارەی کۆمەڵگای خۆجێی زۆرتر لە ئەستۆی کەسانێکە کە توانیویانە بگەنە ئاستی سەرۆکایەتی گوند یا ڕێبەرایەتی ئەنجوومەنی گوندەکان یان ئەنجوومەنی گەلی گوندەکان. دیاری کردنیان بۆ ئەم پۆستانە بەهۆی ڕێزیکەوەیە کە لەنێو گوندنشینەکاندا هەیانە یان بەهۆی متمانەی ڕێبەرە سیاسییەکانی وڵات بەوانە، ئەوان جێگای باوەڕ و بەڕێوەبەری بڕیاراتی ناوەندن. لە بێرمە و ئەندۆنیزیا ئەو کەسانەی لە سووپادا خاوەن پلە و پایە بوون و خانەنشین کراون زۆرتر وەك سەرۆکی گوند هەڵدەبژێردرێن یان باشتر بڵێین دیاری دەکرێن. لە ئاستێکی بەرزتر لە گوندەکان ئەفسەرانی پێشووی سووپا ئیدارەی کاروبارەکان لە ئەستۆ دەگرن. بەرپرسانی ئاماژە پێکراو بەکردەوە لەگەڵ زۆر کێشە بەرەوڕوون، چونکە دەبێ بڕیاراتی بەرپرسانی سەرەوەتر لە پێوەندی لەگەڵ کۆکردنەوەی ماڵیان،سەربازگیری و هتد... بەڕێوەبەرن و لەگەڵ گوندنشینەکان یان کەسانی خۆجێی بەردەوام لە کێشەدا بن.

مووچەی دەوڵەتی لانی کەم لە تەواوی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە ئاستێکی خوارەوەیە و هەزینەی ژیان زۆر لە سەرەوەیە. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٩٢، ئۆتۆمۆبیلێکی دەستی دووەمی تویۆتا پاش دانەوەی سوودی بازرگانی و ماڵیات بۆ کەسێکی نیشتەجێی ڕانگون نزیکەی سێ هەزار دۆلار تەواو دەبێ، لە حاڵێکدا داهاتی سەرانەی هاووڵاتییەکی ئاسایی لە شارەکانی بێرمە هەزار دۆلاری ئەمەریکاییە. لە بێرمە و زۆربەی وڵاتانی ناوچە، بەتایبەت وڵاتانی سۆسیالیستی بوونی پلە و پایەی حکوومەتی بە تایبەت لە ئاستی سەرەوەدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵك لە ئیمکاناتی تایبەتی و هەندێك جاریش بەشێوەی نایاسایی کەڵك



وەرگرن. هۆی سەرەکی چوونی خەڵك بۆ نێو حیزبەکان، ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان و هتد... دەستراگەیشتن بەم ئیمکاناتانەیە. فەرمانبەرێکی دەوڵەتی بۆ ئەوەی بتوانێ دەرەقەتی خەرجی زۆر بێ، لە ئیمکاناتی لاوەکی کاری خۆی کەڵکی خراپ وەردەگرێ و لە بنەڕەتدا گەندەڵی ئیداری لەم ناوچەیەدا شتێکی باوە. ڕۆژنامە بیانی و نێوخۆییەکان بەردەوام ڕاپۆرتی گەندەڵیی دەوڵەتی دێننە بەرباس. بۆ نموونە بەپێی ڕاپۆرتی یەکێك لە ڕۆژنامە پڕ تیراژەکانی ناوچە مارکۆس، سەرۆك کۆماری پێشووی فیلیپین، لە مووچەیەك نزیك بە پێنج هەزار دۆلار لە ساڵدا بە درێژایی حکوومەتی بیست ساڵەی خۆی (١٩٦٧-١٩٨٦) نزیك بە دە میلیارد دۆلاری ئەمەریکایی لە بانکەکانی دەرەوە کۆکردۆتەوە. لە ئاستی خوارەوەتریش ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەرانی دەوڵەتی خەریکی کاری نایاساین.

### کاریگەریی مەزهەب لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی دەسەڵات لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا مەزهەب بوو، کە پاش جەنگی دووەمی جیهانی گرینگییەکی تایبەتی پەیدا کردبوو. لە دەیەی ١٩٩٠ سێ ڕەوت لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا دەرکەوتن کە ڕەنگە گرینگترینیان گەشەی سێکۆلاریزم، واتە جیایی دین لە سیاسەت بوو، کە لە بنەمای گەڵاڵەکانی ئەمەریکا لە ناوچەدا بەڕێوە دەچوون. لەم بوارەدا ڕێبەرە سیاسییەکانیش لە کەمکردنەوەی گرینگی مەزهەب هاوڕێیەتی ئەم گەڵاڵەیەیان دەکرد[1]. لە وڵاتانی سۆسیالیستی حیزبە دەسەڵاتدارەکان بەشێوەی بەربڵاو پێشیان بە ئەمەریکایی کردنی وڵاتەکانیان دەگرت، بەڵام ڕوون نەبوو کە تا چ کاتێك دەتوانن ئەم کۆنترۆڵە درێژە پێبدەن. ڕێبەرانی وڵاتە کۆمۆنیستەکان پێشگیرییان لە بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی ئایینی و خۆپێشاندانی هاوچەشن دەکرد و داوایان لە هاووڵاتیان دەکرد کە لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکاندا بەشداری نەکەن. لە ئەندۆنیزیا بەپێی پێنج بنەماکەی پانجلاسیلا، باوەڕ بەخودا یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانە و هەموو هاووڵاتیان دەبێ پابەندی بن، بەڵام لە قۆناغی دواییدا ڕژێمی گولکار سوهارتو لە ترسی گۆڕانکاری سیاسی بەرامبەر بە مەسەلە دینییەکان،

(1) Fied, R. Vonder Mehden, Religion and Nationalism in Southeast Asia, 1983, p.35.

بەتایبەت بیروباوەڕی ئیسلامی، دژکردەوەی خراپی نیشاندا و لەگەڵ بناژوویی ئیسلامی بەتوندی بەربەرەکانێی کرد. سەرەڕای ئەمەش گۆڕانکارییە مەزهەبی و سیاسییەکان لەم ناوچەیەدا رووی لە زیاد بوون کرد، خۆپێشاندانی یەك ملیۆن موسڵمان بە ڕێبەرایەتی ((ئاغا وەحید)) لە جاکارتا ئەمەی نیشاندا.

دووەمین رەوت کە زیاتر لەنێو خەڵك داباو بوو و لانی کەم بە پێچەوانەی رەوتی یەکەمە، پێشوازی بەربلاوی خەڵك لە مەزهەبەکان و بوژانەوەی رێوڕەسمە مەزهەبییەکان بوو. رەنگە بتوانین ئەم دیاردەیە وەك دژکردەوەی نەتەوەکان بەرامبەر بە سێکۆلاریزم دابنێین کە بە توندی لەلایەن دەوڵەتەکانەوە پشتیوانی دەکرا. ئەم دیاردەیە لە وڵاتانی موسڵمان وەك مالیزیا، ئەندۆنیزیا و ناوچە موسڵمان نشینەکانی باشووری فیلیپین زیاتر بەرچاوە. مەسیحییەکانی فیلیپینیش لە بەرامبەر رێوڕەسمە ئایینییەکاندا ئۆگرییەکی زۆریان نیشان دەدا. لە بێرمە و تایلەند مەزهەبی بودا لە حاڵی بووژانەوە و نۆژەنکردنەوەیە هەتا ئەوەی کە لەگەڵ شارستانییەتی نوێ خۆی رێك بخا.

رەوتی سێهەم کە تازە سەری هەڵداوە، گەشەی پڕوپاگەندە و گۆڕانکاری مەزهەبییە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی ناوچەدا. نفووزی هەندێك گرووپی مەسیحی، وەك ئونجلیکەکان[1] لەنێو موسڵمانەکانی ئەندۆنیزیا. ئەم گرووپە لەنێو کاتۆلیکەکانی فیلیپیندا بە شێوەی بەربلاو نفووزیان کردووە. چوونەسەری رێژەی پڕوپاگەندەی بوودایی و مەسیحی لە جاوەی ئەندۆنیزیا خاڵێکی دیکەی ئەم رەوتەیە. بەڵام لە مالیزیا و تایلەند کە بانگەشەکەرە مەزهەبییەکان ئیزنی تەبلیغاتیان نەبووە، ئاڵوگۆڕێك رووی نەداوە.

دەتوانین هەموو ئەم رەوتانە وەك دژکردەوەیەك بەرامبەر بە فشارە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان چاو لێبکەن. بووژانەوەی ئیسلام لەنێو خەڵکی مالی دا دەتوانین وەك ئاکامی چوونە سەری رێژەی کۆچی گوندنشینەکانی مالی بۆ شارە گەورەکانی ئەم وڵاتە و کارکردنیان لە زانکۆکان، قوتابخانەکان و کارگەکان سەیر بکەین. پابەندبوونی ئەم کۆچبەرانە بە ئیسلام لە بەرامبەر چینییە کۆچبەرەکاندا زۆر بەهێز بووە، ئیسلام وەك هۆکاری یەکگرتن جێگای سەرنج بوو، لەڕووی مەزهەبی و ئەخلاقییەوە ئارنشینەکان تاڕادەیەکی بەرچاو کەوتبوونە ژێر کاریگەری خەڵکی گوندەکان. پەرەسەندنی حیزبە ئیسلامییەکان و شۆڕشێك وەك حیزبی

(1) Evangelical Christians.



ئیسلامی (پاس)[1] لە مالیزیا و حیزبی یەکیەتی پەرەسەندوو[2] لە ئەندۆنیزیا وای کرد بەرهەڵستکارانی ئەم ناوچەیە لەگەڵ بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە وڵاتانی دیکە ئاشنا بن و پێوەندییان لەگەڵدا پێك بێنن و بەرامبەر بە بەرپرسانی دەوڵەتی کە بە رواڵەت موسڵمان بوون هەڵوێست بگرن و سیاسەتەکانیان بخەنە ژێر پرسیارەوە. ئاوردانەوە لە نەریتەکانی رابردوو لە باشووری تایلەند و لە دوورگەی مینداناو[3]ی فیلیپین پەرەی ئەستاند لەم ناوچانەدا کەمایەتییە موسڵمانەکان لەگەڵ کۆلۆنیالیزم خەباتیان دەکرد. لە فیلیپین ٧٨ لە سەدی خەڵك کاتۆلیك، ٥ لە سەد پرۆتستان و ٥ لە سەد موسڵمانن. لەم وڵاتەدا سنووری نێوان سیاسەت و مەزهەب روون نییە بۆ وێنە ئۆسقۆفی گەورەی مانیل رۆڵی دیار و چارەنووسسازی لە رووخانی فردیناند مارکۆس (١٩٨٦)دا هەبوو. وێستگەی رادیۆیی کاتۆلیك بەشێوەی ئاشکرا پشتیوانیی لە سیاسەتەکانی دژی مارکۆسی دەکرد و داوای لە هەموو لایەنگرانی کلێسا و کۆمەڵگای مەسیحی دەکرد لە خۆپێشاندان دژی مارکۆس بەشداری بکەن.

لە دەیەی شەست هەتا هەشتا بودیسم تراوادا بەشێوەی بەرچاو کەوتبووە ژێر کاریگەری سیاسەتەکانی دەوڵەتی تایلەند. بودیسمە تایلەندییەکان بەهۆی باوەڕیان بە نوێبوونەوە لەلایەنگری کردنی بودسیم خۆیان پاراست و رۆژ بەرۆژ ژمارەی لایەنگرانی بوودایی کەم دەبووەوە. کەمتر کەسێك لەم مەزهەبەدا بەرامبەر بە پۆشینی بەرگی راهیبەکان ئۆگرییان نیشان دەدا. لە لاوس و کامبۆدیا رژێمە سۆسیالیستەکان، زیاتر بودیسمیان دەخستە ژێر چاودێرییەوە. بەڵام لە بێرمە و تایلەند کە بودیسم هۆکاری یەکگرتنی ئەوان بوو، بەرپرسانی مەزهەبی لەلایەن خەڵکەوە پشتیوانیان لێدەکرا. پاش سەربەخۆیی بێرمە بودیسم تراوادا لەم وڵاتەدا بووژایەوە و بەرپرسانی دەوڵەتی بەشێوەی رەسمی و نارەسمی پشتیوانیان لە مەزهەب و پەرەپێدانی دەکرد و بەڕێوەبردنی رێوڕەسمە ئایینییەکان بە شێوەی بەکۆمەڵ و تاکەکەسی لەم وڵاتەدا پەرەی گرت. لە حاڵێکدا کە دەوڵەتی بێرمە نەیدەتوانی هەزینەی پێویست بۆ گەشەپێدانی کشتوکاڵ و پیشەسازی دابین بکا، بەڵام بەرپرسانی مەزهەبی خاوەنی بڕێکی زۆر ئاڵتون و پارەبوون. چونکە خەڵك ئامادە بوون و ئێستاش هەن کە دارایی زۆرکەمی خۆیان بۆ

(1) Parti Islam Se Malaysia (DAS).
(2) United Development Parti (UDP).
(3) Mindanao.

پەرەپێدانی مەزهەبەکەیان تەرخان بکەن. بێرمە بە داهاتی سەرانەی ١٨٠ دۆلار لەساڵدا وڵاتێکی زۆر هەژارە. پاش سەرکوتی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی لە ساڵی ١٩٨٩ و زیندانی کردنی رێبەری ئەنجوومەنی دیموکراتیك، ئانگ سان سووکی و دامەزرانی شووړای پاراستنی سەقامگیری و هێمنی نێوخۆیی خەڵك هۆگرییەکی زیاتریان بە مەزهەب نیشاندا. خەڵکی بێرمە بەدوای ساڵی ١٩٦٢ زیاتر لە ٣ ملیۆن و ٢٥٠ هەزار دۆلاری ئەمەریکاییان بۆ دامەزرانی بینایەکی مەزهەبی لە رانگون تەرخان کرد.

بووژانەوەی مەزهەب لە سەرتاسەری ناوچە، نوخبەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیای هێنایە سەر ئەو بڕوایە کە لە روانگەیەکی دیکەوە سەیری مەزهەب بکرێ. وشیاری و تێگەیشتنی ئەم نوخبانە لە پێشکەوتنە نوێیەکانی زانست بووە هۆی ئەوەی کە لە نێوان مەزهەب و ئەفسانەدا جیاوازییەکی زۆر دابنێن. لە دەیەی ١٩٨٠ لە ڤییتنام چی دیکە بودیسمیان وەك نەریتێك چاو لێ نەدەکرد، بەڵکو مەزهەبێك بوو کە هەم لەلایەن کۆمەڵانی خەڵك و هەم لەلایەن خوێندەوارەکانەوە وەردەگیرا. خوێندەوارانی ڤییتنامی کە بۆخۆیان سەرقافڵەی چالاکییە مەزهەبییەکانی ئەو وڵاتە بوون کۆمیتەی ناوەندی پرستگەی بوداییان لە ڤییتنام دامەزراند و لە ساڵی ١٩٨١ قوتابخانەی بەرزی لێکۆڵینەوە و راڤەی بودیسمیان بونیادنا. دەوڵەتی هانۆی لە سەرەتادا بە توندی دژکردەوەی نیشاندا، بەڵام لە دوو ساڵی دواییدا (لە ساڵی ١٩٩١ بەدواوە) دەوڵەتی هانۆی بۆ سەرقامگیرکردنی رەوشی نێوخۆیی- لە سەربەخۆیی زیاتریان لەخۆیان نیشاندا هەتا بتوانن سەرمایە دەرەکییەکان راکێشن، دەوڵەتی ڤییتنام لەم رێگایەدا هەندێك جار ئەوەندە دەچووە پێش کە پێش لە بنەما مەزهەبییەکان و نەریتە کۆنەکان دەکەوتن، تەنانەت ئەگەری ئەوە هەیە ئەم شێوازە ببێتە هۆی گۆڕانکاری لە پێکهاتەی سیاسی ئەم وڵاتەدا.

بێجگە لەو شوێنانەی کە دەوڵەت دژکردەوەی بەرامبەر بە مەزهەب نیشان دەدا لە ناوچەکانی دیکەی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا زۆربەی خەڵك پابەندبوون بەو هەڵسوکەوتە مەزهەبییە کە لەگەڵ نیازە رحی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەوان یەکی دەگرتەوە و لە هەندێك حاڵەتدا کە نەریت لەگەڵ نیازەکانیان یەکی نەدەگرتەوە، دەیانگۆڕی یان بەتەواوی دەستیان لێ هەڵدەگرت و جارێکی دیکە سەلماندیان کە مەزهەب دیاردەیەکی پێوەندی بە هەموو قۆناغ و چاخەکانەوە هەیە و دەتوانێ لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم خۆی بگونجێنێ. مالیزیا کە هەر ئێستا بە زیاتر لە ٥٠ ملیارد دۆلار بەرهەمی ناپالفتەی نێوخۆیی بەکردەوە وڵاتێکی پەرەگرتوویە و لە بەرهەمی نێو گەیەنیەرەکان و چییە کامپیوتێرییەکان لە دونیادا



پلەی دووەم و سێهەمی هەیە، هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنە پیشەسازییەکان بەردەوام مەسەلەی گەڕانەوە بۆ خۆیەتی هێناوەتە بەرباس و سەلماندوویەتی بیرۆکەگەلێك وەك ئەوەی کە فەرهەنگ، نەریت، مەزهەب و هتد... لەژێر کاریگەری مودێرنیزمدا بەرەبەرە گۆڕانیان بەسەردادێ و روونی و ئاشکرایی خۆی لەدەست دەدا دوورە لە راستی و ئەوەی کە مۆدیرنیزم، فەرهەنگی نەریتی و مەزهەبی لەنێوبردووە یان قووتی داوە دروست نییە و نەریت و مۆدێرنیزم دەتوانن پێکەوە هەڵ بکەن.

### شارنشینی و ئاسەوارە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەکەی

لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیادا شارنشینی و ئاسەوارەکەی بەشی زۆری خەڵکی خستووەتە ژێر کاریگەرییەوە. گەشەی خێرای شارنشینی چوارچێوەی سروشتی ئەم ناوچەیەشی تووشی گۆڕان کردووە. پەرەسەندنی شارنشینی بە رادەیەکە، کە ناتوانین بارودۆخی ناوچەکە لەگەڵ قۆناغی کۆلۆنیالیزم کە گەشە نەکردووترین ناوچە بوو، بەراورد بکەین شارە گەورەکانی ناوچە وەك جاکارتا، بانکۆك، کوالالامپور و مانیل بوونەتە ناوچەیەکی گەورە و هەموو ئاسەوارە خراپەکانی شارنیشنی لەگەڵ دایە. لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠ حەشیمەتی بانکۆك نزیکەی ٧ ملیۆن و جاکارتا هەشت ملیۆن و پێنج سەد هەزار کەس بووەو مانیلی گەورە نۆ ملیۆن، واتە ١٣ لە سەدی تەواوی حەشیمەتی فیلیپینی لەخۆ جێکردووەتەوە. سەرەڕای چوونە سەری ژمارەی لە دایك بووان، شارنشینی هۆکاری دیکەی هەیە، وەك باشبوونی بارودۆخی ئابووری، دەستراگەیشتن بەکار و کارکردنی بەردەوام لە بەشە خزمەتگوزارییەکان و کارە پیشەسازییەکان، کەڵك وەرگرتن لە ئیمکاناتی پەروەردەیی و دیاردە سەرنجراکێشەکانی ژیانی شاری، لەو شوێنانەی زەوی کەم و حەشیمەتی گوندەکان زۆربوو، وەك جاوە، گوندنشینەکان روویان لە شارەکان کردووە هەتا لەو فشارە رزگاریان بێ. لەو حاڵەتانەدا کە ئیمکاناتی کارکردن لە شارەکان زۆرتر بووە، وەك ناوچە پیشەسازییەکان لە مالیزیا، خەڵکی روویان لەو ناوچانە کردووە بەبێ ئەوەی بەرورووی فشارێك بوو بێتنەوە. دیارە لەنێوان ئەم دوو گرووپەدا، گرووپی سێهەمیش هەیە کە لە بارودۆخێکی تایبەتیدا چوونەتە شارەکان و پێیان دەڵێن کۆچبەری ئەدواری، وەك ئەو ژن و پیاوانەی کە لە قۆناغی داکشانی کشتوکاڵی بۆ وەدەستهێنانی بژێوی روو لە شارەکان دەکەن. لە جاکارتا ئەم کۆچبەرانە لە شوێنی حەسانەوەی کرێکاران کە رەوشێکی زۆر خراپیان هەیە دەژین و لە ناوچەکانی دیکە وەك فیلیپین، لەو شوێنانەی کە بە

شارە گەورەکانەوە نزیکن بەشێوەی کاتی دەژین، وەك ناوچەی سبانو[١] لە مانیل. لە ساڵی ١٩٦٠ کە ژمارەیەکی زۆر لەم کۆچبەرانە ماوەی مانەوەی خۆیان لە شارەکان درێژتر کردەوە، رووبەڕووبوونەوە لە نێوان ئەوان و شارنشینە رەسەنەکان دەهاتە پێش. زۆربەی ئەم کۆچبەرانە پێوەندی خۆیان لەگەڵ گوندەکانیش دەپاراست، بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوبەش یان لەکاتی خراپ بوونی باری گوزەران لە شار دەگەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان. لێکۆڵینەوە ئاکادمیکەکانی ناوچە بەتایبەت لێکۆڵینەوەکانی ئەنیستیتوی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا لە سەنگاپوور کە لە ناسینی ناوچە پێشتر لە هەموو دامەزراوە زانستییەکان بوون، نیشانی داوە کە تەنیا ئەو گوندنشینانەی کە ژیانێکی باشیان هەیە یان پێگەیەکی پتەویان لە شارەکاندا هەیە، مەترسی راگوێزرانی یەکجاری بۆ شارەکان قبووڵ دەکەن.

ژیانی شاری لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بووەتە هۆی پێکهێنانی دوو دیاردەی نوێ. یەکەم: شارەکانی ئاماژەپێکراو رۆڵی زیاتر لەوەی لە قۆناغی کۆلۆنیالێزمدا وەك ناوچەی ئەنبارکردن دەیانگێڕا، گرتووەتە ئەستۆ. ئەوان پێکهاتەی کۆمەلایەتی و ئابووریی تایبەت بە خۆیان پێکهێناوە و پێوەندی پێویستیان لەگەڵ گوندەکانی وڵات دامەزراندووە. دووەم: چینی کرێکار شکڵی گرتووە کە ئاسەوارەکەی لەلایەك هەست کردن بە بێگانە بوون و لە هەمان کاتدا هاوپێوەندی نوێ و پێکهێنانی ویژدانی چینایەتییە و لەلایەکی دیکەوە سەرهەڵدانی لایەنەکانی یرۆکراتیکی رۆژئاوایی لەگەڵ چینی بەڕێوەبەریی و چینی نێونجییە. بەم گۆڕانکارییانە ژیانی خەڵکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا گۆڕانی بەسەرداهات، چونکە ناوچە دەوڵەمەندنشینەکان، ناوچەکانی تایبەت بە چینی نێونجی و ناوچە پەراوێزنشینەکان بۆ کەسانی کەم داهات یان کرێکارانی زەحمەتکێش پێکهاتووە، بەجۆرێك کاتێك پێ دەنێتە ماکاتی[٢] لە مانیل یان پوندوك ئیندا[٣] لە جاکارتا هەست دەکەی کە لە پەراوێزی شارەگەورەکانی وەك تاران، لەندەن یا پاریسیت.

(1) Cebuano.
(2) Makati.
(3) Pudorg Inda.



دژکردەوەی چینی کرێکار بەرامبەر بە بارودۆخی کاری رۆژانەیان لە شوێنە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازبوو. پیشەییەکان دەسەڵاتخوازەکان زۆربەی دژکردەوەی کرێکارانیان کۆنترۆڵ دەکرد یان رژێمە سۆسیالیستەکان (کە بەرەو تواندنەوە دەچن) هەڵسووکەوتەکانیان دەخستنە ژێر چاودێرییەوە. ئەنجوومەنە سینفییەکان هێشتا لە ناوچەدا پەرەیان نەگرتووە و لانی کەم شاهیدی هیچ مانگرتنێك نین، گوندنشینی و فەرهەنگی گوندی هێشتا گرینگی زۆری هەیە. لە شارەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وشەگەلێك وەك کامپۆنگ[١]، باریۆ[٢]، بن[٣] و یودا[٤] بۆ وەسف کردنی ناوچە یان گەڕەکێکی شار کە خەڵکەکەی لەگەڵ یەکتر پەیوەندی گوندییانە یان خزمایەتییان هەیە کەڵك وەردەگرن. هەستی خۆجێیەتی زۆر بەهێزە و ئەمە بۆخۆی نیشاندەری گەڕانەوە بۆ خۆیەتییە کە لە بەرامبەر مۆدێرنیزمدا هاتووەتە بەرباس. دیاردەکانی شار رووی لە گوندەکان کردووە و بەکردەوە رووخساری شارێکی بچووکی پێ دراوە.

لە ڤییتنام زۆرتر حەشیمەتی شارەکان، لە خەڵکی گوندەکان پێك دێن و ژمارە و ئاماری فەرمی ئەم مەسەلەیە نیشان دەدا. لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٩ لە حەشیمەتی ٢,٥ ملیۆن کەسی هانۆی دوو سێهەمی خەڵکی گوندەکان بوون. دەتوانین ئەم ژمارەیە لەگەڵ سەرژمێری شاری هۆشی مین بەراورد بکەین، کە تەنیا یەك چوارەمی حەشیمەتەکەی خەڵکی گوندەکانن. لە قۆناغی کۆلۆنیالێزمدا، شارە گەورەکان شوێنی نیشتەجێبوونی کەمایەتییە ئەتنیکەکان بوو وەك چینییەکان و زۆربەی خەڵکی خۆجێی لە گوندەکان و بە دوور لە ناوەند دەژییان (لە بێرمە هیندییەکان لە ناوەندی وڵات دەژین). بەڵام ئێستا بەو جۆرە نییە، چونکە چینییە دەوڵەمەندەکان دەچوونە شارەگەورەکان یان ژمارەیەکی زۆر لەوان وڵاتگەلێك وەك ڤییتنامیان بەهۆی نەبوونی سەقامگیری سیاسی، ئاسایش و ئابووری بەجێ دەهێشت. لە وڵاتەکانی وەك مالیزیا و فیلیپین خەڵکی خۆجێی بە کۆمەڵ دەچوونە شارەکان و جێگای کۆچبەرە بێگانەکانیان

(1) Kampong.
(2) Bario.
(3) Bon.
(4) Yoae.

پردەکردەوە. لە دەیەی ١٩٥٠ کۆچی دەیان هەزار هیندی لە بێرمە بووە هۆی ئەوەی کە بۆ یەکەمین جار زۆربەی حەشیمەتی ڕانگون لە بێرمەییەکان پێك بێ.

شارە گەورەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەکردەوە نەیانتوانیووە بەم حەشیمەتە زۆرە ڕابگەن و خزمەتگوازی پێویستیان پێشکەش بکەن. خەڵکی ئەم شارانە بەگشتی لەگەڵ کەمیی ئاو و کارەبا و کێشەگەلێك کە بەهۆی سێلاوە وەرزییەکانەوە بەتایبەت لە بانکۆك دێتە پێش، بەرەوڕوون. کێشەی هاتووچۆش لە بانکۆك، جاکارتا، ئەم دواییانەش لە کوالالامپور دیاردەیەکی بەرچاوە. هەروەها لە هەندێك لە شارەکان داهاتی ناڕەسمی هەیە کە بە کردەوە لە سیستەمی ئابووری وڵاتدا جێگایەکی دیاری نییە و کێشە خوڵقێنە، وردە بازرگانەکان، وردە فرۆشیارەکان، لێخوری کالسکە چینییەکان و هتد... لەم گرووپەن. ئەم کەسانە تەنیا ژیانێکی لە پەراوێزخراویان هەیە و بە زەحمەت دەتوانن بژێوی ژیانیان دابین بکەن، بۆ وێنە لە جاکارتا ئەم کەسانە پاش دابینکردنی جەرخیی خۆراك و هاتووچۆی خۆیان تەنیا نزیکەی ٢٠ دۆلاری ئەمەریکاییان لە مانگدا بۆ دەمێنێتەوە کە دەبێ بۆ بنەماڵەکانیان کە لە گوندەکان دەژین، بنێرن. ڕژێمە دەسەڵاتدارەکانی ناوچە چ سۆسیالیست و چ غەیرە سۆسیالیست ئەم کەسانەیان وەك ڕیسوای کۆمەڵگا چاو لێکردووە و لەسەر ئەو بڕوایەن ئەم کەسانە جێگای مەترسین، چونکە هەستی دژی حکوومەتی لەم کەسانە بەهێزە و دەتوانن ئامانجەکانی سەرمایەداری یا مۆدێرنیزمی سۆسیالیستی بخەنە ژێر پرسیارەوە و ئاسایشی وڵات تووشی مەترسی بکەن. لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ کەسانی بێ سەرپەنا لە شارەکانی جاکارتا، ڕانگۆن و هانوی لە شەقامەکان کۆکرانەوە و نێردرانە ئەو ناوەندە دەوڵەتییانەوە کە ئەرکی پێ ڕاگەیشتنی ئەو کەسانەیان لەسەر شانە. پاش ماوەیەك ئەم کەسانە دووبارە ڕوویان لە هەمان کاری پێشوو دەکردەوە و بۆ دەوڵەت کێشەیان پێك دەهێنا.

هەروەها لە قۆناغەی جۆراوجۆرەکاندا هەوڵ و کۆششێك بۆ پاككردنەوەی زاغەنشینی لە شارەکانی ئاماژەپێکراو بەڕێوەچوو و نیشتەجێ بووانی ئەم ناوچانە بۆ پەراوێزی شارەکان ڕاگوێزران. ئەم مەسەلەیە بووە هۆی ئەوەی کە کەسانی هەژار و بێ خانوو لە بارودۆخێکی خراپتر و بە ئیمکاناتێکی کەمتر ناچار بن بژین. لەم ناوچانەدا خزمەتگوزاری پێشکەش ناکرێ





و هەرجۆرە گەندەڵییەك لە داهاتوودا دەبێتە قەیرانێکی گەورە. ئەگەر حەشیمەتی شارە گەورەکان کەم بێتەوە ئەم قەیرانەش کەمتر دەبێتەوە.

کەمایەتییە مەزهەبی، ئەتنیکەکان و کاریگەریی کۆمەلایەتی و سیاسیی ئەوان لەکاتی پاشەکشەی کۆلۆنیالیزمدا زۆربەی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا هەوڵیاندا لەلایەك ئالۆزییەك کە بەهۆی دووبەرەکی ئەتنیکی، زمانی و مێژوویی هاتبووە ئاراوە، کەم بکەنەوە و لەلایەکی دیکەوە هاوپێوەندی سیاسی و وەفاداری بە وڵات-کە لە ئەسڵدا، بناغەی پێك هێنانی وڵاتێکی مۆدێرن و پێشکەوتووە- ببەنە سەرەوە. ڤییتنام بە ٥٣ گرووپی کەمایەتی کە لەم وڵاتەدا دەژین، وێنەیەکە لەم چەشنە کۆمەڵگایانە. جێگای سەرنجە ئەورووپاییەکان لە قۆناغی دوورودرێژی کۆلۆنیالیزم لە ناوچەدا، جیاوازییە ئاماژەپێکراوەکانیان بە کردەوە هەست پێ نەدەکرد. یەکێك لە بەرپرسە ئەورووپاییەکان کە کتێبێکی سەبارەت بە بێرمە نووسیووە تەنیا ئاماژەی بە پێنج گرووپی ئەتنیکی کردووە و پێی وابوو کە جیاوازییەکان لە بێرمە زۆر کەمە، لە حاڵێکدا بارودۆخی بێرمە لەم بارەیەوە وەك ڤییتنامە و تەنیا ٣٣ لەسەدی حەشیمەتی ئەم وڵاتە بێرمەییە.

مەسەلەی کەمایەتییە خۆجێییەکان بۆ حکوومەتەکانی ناوچە دوو قەیرانی خوڵقاند یەکەم ئەوەی کە وڵاتەکان لە سەدەی بیستەمدا دەبێ خاوەنی یەك ئامانج بن. وڵاتەکان و نەتەوەکان لە زۆربەی حاڵەتدا تێکەڵ دەکرێن کەواتە، ئەم بیرۆکەیە هەیە کە لە سیستەمی نێونەتەوەییدا هەر وڵاتێك نوێنەری نەتەوەیەکە. لەلایەکی دیکەوە هەموو وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەنێو سنوورەکانی خۆیاندا خاوەنی چەندین گرووپن کە دەڵێن لە گرووپی زۆرینە کە وڵات ناوی لەوانەوە وەرگرتووە جیاوازن. لە هەندێك لە وڵاتەکان وەك ئەندۆنیزیا و فیلیپین نەتەوە دیاردەیەکی دەستکرد و سەپێندراوە. تا کاتێك هۆڵەندا، هیندی ڕۆژهەڵاتی هۆڵەندای نەناساندبوو، نەتەوەیەك بەناوی ئەندۆنیزیا بوونی نەبوو، چونکە بۆ ڕێبەرانی ئەندۆنیزیا زۆر ئاسان بوو دروشمی نەتەوەییان واتە یەکگرتن لە جۆراوجۆرییەکان بکەنە سەردێری کارەکانیان و بڵێن تەواوی گرووپە ئەتنیکی و فەرهەنگییەکان دەتوانن لەم چوارچێوەیەدا جێی خۆیان بکەنەوە. ئەو هەوڵانەی بۆ پێکهێنانی سیستەمی فیدراڵ لە ئەندۆنیزیادا دراوە هەموویان لەگەڵ شکست ڕووبەڕوو بووە و سیستەمگەلی یەك جەمسەری لە ناوچەدا زاڵ بوون.

ئەم مەسەلەیە لەو وڵاتانەی کە بیرۆکەی ئەتنیکی بەشێوەی چڕوپڕ لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی لە پێوەندی دایە، ئاڵۆزییەکی زۆرتری هەیە. بۆ وێنە داوای پێوەندیدار بە بوونی مافی دەسەڵاتی سیاسی خودموختار بۆ کەسانێك کە خۆیان بە نوێنەری ((کارنەکان))، ((شانەکان))، ((کارنی))، ((چینەکان)) و ((چینییەکان)) دەزانن دوای ساڵی ١٩٤٥ هاتە بەرباس. دوای جەنگی دووەمی جیهانی بیرۆکەی ئاماژەپێکراو بەهێزبوو، چونکە لەگەڵ راگەیەندراوی پێوەندیدار بە مەسەلەی نەتەوەکان کە لەلایەن بیرمەندانی مارکسیزمەوە پێشکەش کران، یەکی دەگرتەوە. کەواتە، یەکەمین گەڵاڵەداڕێژەرانی یاسای بنەڕەتی بێرمە، خودموختارییەکی ناڕوونیان بۆ کەمایەتییەکانی خۆیان لەبەرچاو گرتبوو[1]. لە کردەوەدا هیچ مافیك بۆ کەمایەتییە بێرمەییەکان دەستەبەر نەکرا بوو و دەوڵەتی ناوەندی بە توندی لەگەڵ هەر جۆرە خودموختارییەك رادەوەستا و رێبەرانی ئەو بزووتنەوانەی ئاماژەی پێکرابوون لە دەسەڵات لابرد. لە ساڵی ١٩٦٢ دەوڵەتی رانگون هەر جۆرە خودموختارییەکی بە راشکاوی رەتکردەوە و سەرەڕای ئەوەی کە حەوت هەرێمی ناوچەیی و ئەتنیکی لەم وڵاتەدا بوو هەموویانی بەشێوەی یەکسان شوێنکەوتووی حکوومەتی ناوەندی راگەیاند. بزووتنەوە خەڵکییەکان هەموویان سەرکوت کران و هیچ کامیان بچووکترین سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا.

حیزبی کۆمۆنیستی ڤییتنام لە ساڵی ١٩٧٦ راشکاوانە رایگەیاند، کە خوازیاری چارەسەری کێشەی نەتەوەکان و کەمایەتییەکانی ڤییتنامە و رێگا چارەیەك کە پێشکەشی کرد هاوشێوەکردنی ئابووری و فەرهەنگی ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵات بوو. چەندین ئۆرگانی هەرەوەزی بۆ بەڕێوەبردنی ئەم گەڵاڵەیە پێك هات، بەڵام بە کردەوە شکستی خوارد، چونکە نەریتە ئابوورییەکانی ئەو ناوچانەی باسکران لەبەرچاو نەگرتبوو. لە ڤییتنام هاوشێوەکردنی پەروەردەی کەمایەتییەکان و نەتەوەکان وەك سیاسەتی سەرەکی لە سەرووی هەموو شتێك دانرا. لە ساڵی ١٩٨٢ بە مەبەستی هاندانی خوێندکارانی خێمیر لە ڤییتنام بۆ خوێندن لە قوتابخانەکانی ئەم وڵاتە، خوێندکاران کە قوتابخانەی سەرەتاییان تەواوکردبوو، دەیانتوانی بە

(1) Trager, Frank N., Burma: From Kingdom to Republic (1966). Oxford Press, 1985, pp.19-20.



پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە لە ئاستی ئەواندا بوون، بەبێ تێپەڕکردنی تاقیکاری بچنە قوتابخانەی ناوەندییەوە. زمانی ڤییتنامی زمانی رەسمی بوو و بەهۆی ئەوەوە تەواوی کەمایەتییەکان فێری زانست و سەرکەوتنە فەرهەنگی و ماددییەکانی خەڵکی دیکە بوون. سەرەڕای هەموو ئاسانکارییەکان خوێندکارانی ناوچە کوێستانییەکان زووتر لە کەمایەتییەکانی دیکەی ناوچەی باکوور دەستیان لە خوێندن هەڵدەگرت.

وڵاتانی دیکە وەك تایلەند شێوەیەکی جیاوازیان گرتبووەبەر. بۆ وێنە کاتێك خەڵکی ناوچە کوێستانییەکانی باکووری وڵات دژی خەڵکی دەشتایی راوەستان، لەگەڵ بەرگریی دەوڵەت رووبەڕوو بوون. دەوڵەتی بانکۆك بە تەواوی هێزەوە و تەنانەت بە کەڵك وەرگرتن لە ناپاڵم پەلاماری گوندەکانیدا. دواتر دەوڵەت شێوازی خۆی گۆڕی و رێگای سازان و هاوشێوەکردنی گرتەبەر و سیاسەتی ئاسیمیلاسیۆنی[1] وەلانا. لە مالیزیا لە حاڵی حازردا دەوڵەت رێگای دابەشکردنی عادیلانەی گرتووەتە پێش، هەتا چیی دیکە ئابووری و هێزی ئابووری تایبەت بە ئەتنیکێك بۆ وێنە، چینییەکان نەبێ. دەوڵەتی کوالالامپور لە ساڵی ١٩٧٠ سیاسەتێکی نوێی ئابووریی بیست ساڵەی دارشت و توانی هێزی ئابووری مالاییەکان کە لەو ساڵەدا تەنیا ٢ لە سەدی تەواوی داراییەکانی وڵات بوو بگەیەنێتە ٢٠ لە سەد. لە سیاسەتی نوێی دەوڵەت بە ناوی سیاسەتی نوێی پەرەسەندن کەلە ساڵی ١٩٩١ ماهاتیر محەمەد، سەرۆك وەرزێری مالیزیا، رایگەیاند رێگای پێشوو بە شێوازی نوێ بۆ کەمکردنەوەی کێشە چینایەتییەکان دەگرنەبەر.

لە بێرمە دەوڵەت بۆ نەهێشتنی قەیرانی کەمایەتییەکان پێی لەسەر پڕۆگرامە ئابووری و پەروەردەییەکانی دادەگرت. دەوڵەتی رانگون بە قبووڵکردنی ئەوەی کە هۆی سەرەکیی ناکۆکی نێوان کەمایەتییەکان، جیاوازی چینایەتی و مەسەلە ئابوورییەکانە، لە ناوچەگەلێك کە لەگەڵ بێکاری و کەمی ئیمکانات بەرەوڕوو بوو، چەندین گەڵاڵەی بەڕێوەبردووە، باشترکردنی سوودی ئابووری بۆ هێنانە خوارەوەی نرخی بەرهەمی کشتوکاڵی و قبووڵکردنی پیاوان و ژنانی گەنجی ناوچە سنوورییەکان لە زانکۆکان بۆ پەرەپێدانی گرووپە

(1) assimilation Policy.

نەتەوایەتییەکان. ئەو کەسانە، پاش تێپەڕکردنی خولەکانی پەروەردەیی و گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان دەستیان دایە وانە وتنەوە و ئەو کارانەی بۆ پەرەپێدانی ئابووری پێویستیە و یەکگرتن و هاوپێوەندی نەتەوەییان بەهێزکرد.

گۆڕانکارییەکانی ناوچە لە هەریەك لە دە وڵاتی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا جۆرە کێشەیەکی ئاڵۆزیان هەیە، کە تەنیا دەتوانین وێنەیەکی گشتی لێ رەسم بکەین. هەست کردن بە گۆڕان لە سیستەمی پەروەردەیی، پێوەندی گرتن، مەزهەب، زمان، سیاسەت و ئابووری بەڕادەیەك بەرچاو بوو کە بە تەواوی، گۆڕانکاریی لە ناوچەدا پێك هێنا و ئەو وڵاتانەی بۆ چوونە نێو سەدەی بیست و یەکەم کە بە سەدەی پاسیفیك ناوزەدکراوە، ئامادە کردووە.

## سەرچاوە بۆ زانیاری زیاتر


1- Bedlington, S. S., Malaysia and Singapore; The Building of New States, Ithaca, N. Y., 1989.

2- Bloodworth, D.; An Eye for the Dragon: Southeast Asia Observed 1954-1990; London, 1991.

3- Broinowski, A. ed; Understanding ASEAN; London, 1992.

4- Coedes, G.; The Making of Southeast Asia; Berkeley, Cal. 1986.

5- Cowan, C. D. ed.; The Economic Development of Southeast Asia; New York, 1990.

6- Dobby, E. G. H.; Southeast Asia; 11th ed, London, 1973.

7- Duncanson, D.; Government and Revolution in Vietnam; London, 1988.

8- Elsbree, W. H.; Japan's Role in Southeast Asian Nationalist Movements; Cambridge, Mass, 1983.

9- Girling J. L. S.; Thailand, Society and politics, Ithaca, 1993.

10- Grossholtz, J.; Politics in the Philippines; Washington, 1992.

11- Halpern, J.; Government Politics and Social Structures in Laos; New Haven, Conn, 1994.





12- Hay, S. N. and M. H. Chase, Southeast Asian History: A Bibliographic Guid, New York 1962.

13- Heine Geldern, R. von.; Conception of State and kingship in Southeast Asia Ithaca, N. Y.; 1990.

14- Hill, R. D. ed.; A systematic Geography of Southeast Asia; Kuala- Lumpur, 1978.

15- Jaurnal of for Eastern Economic Review; Hong Kong.

16- Journal of Modern Asian Studies; Cambridge.

17- Journal of Pacific Affairs; Vancouver.

18- Journal of Southeast Asian Studies; Singapore.

19- Kashin, G. MCT.; Governments and Politics of Southeast Asia; 2nd ed., Ithaca, N. Y., 1994.

20- Kunstadter, P. ed.; Southeast Asian Tribes, Minorities and Nations; 2 vols., Princeton, N. J., 1987.

21- Leifer, M.; Cambodia: The Search for Survival; New York, 1994.

22- McVey, R. ed.; Indonesia; New Haven, Conn.; 1993.

23- Shaplen, R.; Time out of Hand: Revolution and Reaction in Southeast Asia; New York, 1993.

24- Silverstein, J.; Burma: The Politics of Stagnation; Ithaca, NewYork, 1990.

25- Steinberg, D. J. ed.; In Search of Southeast Asia: A Modern History; New York. 1971.

26- Tilman, R. O. ed.; Man, State, And Society in Contemporary Southeast Asia, New York, 1989.

27- Wang Gungwu; Community and Nation: Essay on Southeast Asia and the Chinese; Sydney, 1991.

28- Warner, D.; The Last Confucian; N. Y., 1990.

29- Wolters, O. W.; History, Gulture an Religion in Southeast Asian Perspectives; Singapore 1992.